# تحريم النرد والشطرنج والملاهي



## مسألة في تحريم الغناء والرقص

تأليف

أبي بكر محمد بن الحسين بن عبد الله الآجري



وەرگێڕانی: أبو عبدالله

پێداچونەوە: هلال عبداللە عمر

# پێڕست

## أبو بكر محمدی کوڕی الحسين الآجري رحمه الله دەڵێت :

## أما بعد :

١ - بەڕاستی پرسیارکەرێك پرسیاری کردووە دەربارەی ئەو یاری و ئامێرانەی کە زۆرێك لە خەڵکی یاری پێ دەکەن و بەکاری دەهێنن، وەکو ، زار و شەترەنج و ، شمشار و ، باڵەبان و ، سنج و تەپڵ و عود و کەمانچە و تەنبور، وە هاوشێوەی ئەوانە وەکو یاریکردن بە بەران و کەڵەباب و کۆتر، وە هاوشێوەی ئەوانە لە قومار لەوەی کەوا زۆرێك لە خەڵکی تاقیکراونەتەوە پێی و تووشی بوونە .

جا پرسیارکەرەکە پێی ووت :

ئایا هیچ شتێك لەوانەی باسم کرد لە ئامێرە مۆسیقیەکان مۆڵەت هەیە گوێی بۆ بگیرێ، یان بۆ کەسێك یاری پێ بکاو بەکاری بێنێ؟

وە ئایا کەسێك بۆی هەیە کەوا گوێ لە گۆرانی بگرێ لە گۆرانی بێژێك، یان لە کەنیزەکێك، یان لە ئافرەتێکی ئازاد؟

پرسیارکەر پێی خۆشە وەڵامی هەموو ئەوانە بزانێت .

## وەڵامەکە بە یارمەتی الله تعالى :

هەموو ئەوانەی کە پرسیارکەر پرسیاری لە بارەوە کرد : بەکارهێنانی ، وە یاری کردن پێی : باتڵە و حەرامە بەکارهێنانی ، وە حەرامە گوێ لێگرتنی بە بەڵگەوە لە کتابی الله عز وجل، وە سوننەتی رسول الله ﷺ، وە ووتەی هاوەڵان رضي الله عنهم، وە وتەی زۆرێک لە زانایانی مسوڵمان .

جا حەرامیەتی گوێ گرتن لە گۆرانی کتێبکمان لە بارەوە نووسیوە پێش ئەوە، ڕونمان کردۆتەوە تیایدا حەرامیەتی گوێ گرتنی گۆرانی لە گۆرانی بێژێك، یان لە کەنیزەکێك ، وە حەرامیەتی فرۆشتنی کەنیزەکی گۆرانی بێژ ، وە حەرامیەتی بازرگانی کردن پێیان لە قورئان و سوننەت و وە ووتەی پێشەوایانی مسوڵمانان، بۆیە پێویست ناکات لێرە دووبارە باسی بکەمەوە، وە باسی تەواوی ئەوە دەکەین کە پرسیارکەر پرسیاری لە بارەوە کردووە، وە پێی ڕادەگەیەنین کەوا ئەوانە هەمووی حەرامە .

جا ئەگەر وتی : ئایا دروستە بۆ مسوڵمان کەوا یاری بکات بە شتێك؟

پێی دەوترێ : بەڵێ دروستە.

جا ئەگەر وتی : بە چی؟

پێی دەوترێ : بەوەی کەوا پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێداوە، دوای ئەوە فەرموویەتی لە جگە لەوە : بەڕاستی ئەوە باتڵە، وە دەست دەکەین بە باسکردنی إن شاء الله .

---

: ئەو کتێبە **الدشتي** رحمه الله باسی کردووە لە کتابەکەی (**النهي عن القص والسماع**) ، وە حەدیسێکی هێناوە تیایدا لە سەفوانی کوڕی ئومەییەوە رضي الله عنه، فەرمووی : ئێمە لە لای رسول الله بووین ﷺ، جا عمروی کوڕی قُرّة هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی : ئەی رسول الله، بێگومان بەدبەختیم لەسەرنوسراوە، نابینرێ ڕزقم دەست بکەوێ تەنها بە لێدانێ دەفەکەم نەبێ بە دەستم، جا مۆڵەتم بدە بۆ گۆرانی وتن بەبێ قسەی نابەجێ؟

جا رسول الله ﷺ فەرمووی : (**مۆڵەتت بۆ نییە بە هیچ شێوەیەك یان ڕێزت بگرم، درۆت کرد ئەی دوژمنی الله تعالى، بێگومان الله عزّوَجَل رزقی حەڵاڵ وپاکی داوی، تۆ ئەو ڕزقەت هەڵبژاردووە کە الله عزّوَجَل لەسەری حەرام کردووی لە جیاتی ئەوەی الله تعالى بۆی حەڵاڵ کردووی، ئەگەر من پێشتر تۆم ئاگادار بکردبایەوە ئەوا ئاواو ئاوام لێدەکردی، هەستە لەلام و تۆبە بکە بۆلای الله عزّوَجَل ئەگەر تۆ ئەوکارە بکەیتەوە دوای ئەوەی ئاگادارم کردیتەوە ئەوا لێت دەدەم بەلێدانێکی زۆر بە ئازار، وە سەریشت دەتاشم وەکو نموونەیەك وە دوورت دەخەمەوە لە خێزانەکەت، وە فەرمان بە گەنجەکانی مەدینە دەکەم کە بێن و شتومەکەکانت ببەن**) .

جا عمرو هەستا زۆر بە ترساوی، پێیەوە دیار بوو لە خەم و خراپەو ڕسوایی کە کەس نازانێ تەنها الله تعالى نەبێ، جا کاتێ پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (**ئا ئەو تاوانبارانە، یەکێ بمرێ لەوان بەبێ تەوبە و گەڕانەوە بۆلای الله تعالى**

ئەوا الله تعالى زیندووی دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا وەکو ئەوەی لە دونیادا بووبێ سەرژنانی و ڕووت و بەبێ ئەوەی پارچە جلێکی هەبێ خۆی پێ دابپۆشێ لە خەڵکی، هەرکاتێ هەڵدەستێتەوە دەکەوێتە سەرزەوی) .

الدشتي وتی : ئەو حەدیسە أبو القاسم الطبري و أبو بکر الآجري رحمهما الله هێناویانە لە کتابی (المسألة في تحريم الغناء و الرقص ) .

وە ئەوە توند بوونی بێ سنووری پێغەمبەرە ﷺ بۆ حەڕامیەتی ئەو کارە و دوورکەوتنەوە لێی و لە گوێ لێگرتنی .

## باب - ١

## باسکردنی ئەو شتانەی کە درووستە مسوڵمان یاریان پێ بکات و بەکاریان بێنێ وە جگە لەوانە باتڵە یاری پێکردن و بەکارهێنانیان



**٢** - خالیدی کوڕی یزید دەفەرمووێ کەوا عوقبەی کوڕی عامر رضي الله عنه هەموو ڕۆژێك دەهاتە لام، دەیوت : بابڕۆین ڕم و تیر بهاوێژین، خالید دەڵێ ڕۆژێکیان تەمبەڵیم کرد یان گرانم کرد بۆ دەرچوون لەگەڵی .

جا عوقبەی کوڕی عامر فەرمووی : بیستم رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ليس من اللهو الَّا ثلاثة : مُلاعبةُ الرجلِ أهله، وتأديبُه فرسَه، ورميه بقوسِه . ) وذكر الحديث .

واتە : (لە یاری و ڕابواردن نییە تەنها سێ شت نەبێ : یاری کردنی پیاو لەگەڵ خێزان و منداڵەکانی، وە ڕاهێنان کردن بە ئەسپەکەی، وە هاوێشتنی ڕم و تیرەکەی) وە باسی حەدیسەکەی کرد .

---

: رواه احمد (١٧٣٢١) ، وابو داود (٢٥١٣)

**٣** - عن عقبة بن عامر الجهني رضي الله عنه ، قال : قال رسول الله ﷺ : (إن الله عز وجل يدخل بالسهم الواحد ثلاثة الجنة . . .)، ذكر الحديث .

وقال فيه : (كل شيء يلهوا به ابن آدم باطلٌ إلَّا رَميَه بقوسِه ، أو تأديبه فرسه ، أو ملاعبتَه امرأته) .

واته : له عوقبەی کوڕی عامری جوهەنیەوە رضي الله عنه ، فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی الله تعالى سێ کەس دەخاتە بەهەشتەوە بەهۆی یەك تیرەوە، دروستکارەکەی کە چاوەڕێی خێر و پاداشتە لە درووستکردنەکەی، وە ئەوەی تیرەکە دەهاوێژێت، وە ئەو کەسەی کەتیرەکانی بۆ هەڵدەگرێ و دەیداتە دەستی .

وە فەرمووی : ڕاهێنانی تیرهاوێژی و ئەسپ سواری بکەن، وە تیر هاوێژی کردنتان پێم خۆشترە لە ئەسپ سواری کردنتان، وە هەموو ئەو ڕابواردنە بێ بەهایانەی کە نەوەی ئادەم دەیکات بەتاڵە و تاوانە جگە لە تیر هاوێشتنەکەی بە کەوانەکەی، یان ڕاهێنان کردن بە ئەسپەکەی ، یان یاری کردن لەگەڵ هاوسەرەکەی) .

---

: **رواه أحمد (١٧٣٠٠) ، والترمذي (١٦٣٧)**

**٤ -** عوقبەی كوڕی عامر دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : هەموو شتێ پیاو یاری و ڕابواردنی پێ بكات باتڵە تەنها سێ شت نەبێ : هاوێشتنی تیر بە كەوانەكەی، وە ڕاهێنان كردن بە ئەسپەكەی، وە یاری كردنی لەگەڵ هاوسەرەكەی، بێگومان ئەوانە لە حەقن .

## محمدی كوڕی حسێن دەفەرموێ :

**٥ -** جا ئا ئەوەیە كە بە درووستی دەزانم بۆ مسوڵمان یاری و گاڵتەی پێ بكات، وە نزیك بوونەوە و گوێڕایەڵی تێدایە بۆ الله تعالی .

بۆ تیر هاوێژی بە كەوانەكەی، فێری تیر هاوێشتن دەبێت بۆ ئەوەی جیهادی دوژمنی پێ بكات .

الله عزَّوَجَل دەفەرمووێ : ﴿**وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ**﴾ (**الأنفال : ٦٠**)، جا القوّە : تیر و ڕم هاوێشتنە .

جا كە پیاو تیر دەهاوێژێ ئەوە یاریەكی چاكە مەبەستی پێ الله تعالی بێ، ئەوە ڕێگە پێدراوە .

وە ڕاهێنان كردن بە ئەسپەكەی، وەرزشێكە لەئەوەوە بۆ ئەسپەكەی، وە فێركرنی جەنگە بۆ ئەسپەكەی، چونكە هەر ئەسپێك ڕاهێنانی پێ نەكرێ و فێرنەكرێ سوودی لێ وەرناگیرێ لە جەنگدا، جا ئەگەر

ڕاهێنانی پێ کرد خاوەنەکەی وە دڵخۆش بوو، ئەوا ئەو ئەسپە چاك و ڕاهێنراوە بۆ داواکردن و ڕاکردن - لە جەنگدا - .

وە بەهەمان شێوە یاری و گاڵتەکردنی پیاو لەگەڵ ژنەکەی یان کەنیزەکەکەی، پاداشتی بۆ هەیە لە یاری کردن لەگەڵیان، هاوسەرەکەی دەزانێت کە پیاوەکەی خۆشی دەوێت، بۆیە ئەویش دڵی پێ خۆش دەبێت، وە دڵ خۆش بوونی خێزانەکەی، پاداشتی گەورەی تێدایە بۆی - واتە کە پیاوەکە یاری لەگەڵ خێزانەکەی دەکات، ئەوا خێزانەکەی هەست بەوە دەکات کە خۆشیدەوێت بۆیەش یاری لەگەڵدا دەکات، ئەم دڵخۆشیەش پاداشتی گەورەی تێدایە - .

بێگومان پێغەمبەر ﷺ یاری کردووە لەگەڵ خێزانەکانی بە شێوازێکی ڕێك و پێك و چاك ، وە هانی هاوەڵانیشی داوە کەوا یاری و گاڵتە بکەن لەگەڵ خێزانەکانیان .

---

: **ابن تيميه** لە **(الإستقامه : ١ / ٢٧٧)** دەڵێت : بە صەحیحی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە دەفەرمووێ : (**هەموو شتێ پیاو یاری و ڕابواردنی پێ بکات باتڵە تەنها سێ شت نەبێ : هاوێشتنی تیر بە کەوانەکەی، وە ڕاهێنان کردن بە ئەسپەکەی، وە یاری کردنی لەگەڵ هاوسەرەکەی، بێگومان ئەوانە لە حەقن**) .

وە ئەو کارانەی کە باتڵن : ئەوەیە کە هیچ سوود و قازانجی تێدا نییە، جا ئەوە مۆڵەت دەدرێ تێیدا بۆ ئەو نەفسانەی کەوا سەبر و ئارام ناگرن لەسەر ئەوەی کەوا

**سوودی دەبێت بۆیان، وە ئەوەش حەق و پێویستە لەو کاتانەی کەوا دەخوازێ بکرێن وەکو: جەژنەکان و هاوسەرگیری کردن و گەڕانەوەی کەسێکی غائب وە هاوشێوەی ئەوانە، وە ئەوە نەفسی ئافرەت و منداڵانە، جا ئا ئەوانە بوون کەوا گۆرانیان دەووت و دەفیان لێدەدا لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ و جێنشینەکانی، بەڵام پیاوەکان ئەو کارە لە ناویاندا نەبووە، بەڵکو پێشینانمان ناویان لە پیاوی گۆرانی بێژ دەنا : نێرەموك لەبەر خۆچواندنی بە ئافرەتان .**

**هەروەها *ئیمامی مسلم* ڕیوایەتی کردووە (١٩١٨) لە عوقبەی کوڕی عامرەوە رضي الله عنه، دەفەرمووێ: بیستم رسول الله ﷺ دەیفەرموو : (زەویەکان فەتح دەکرێن لە لایەن ئێوەوە، وە الله تعالى بەسە بۆتان، بۆیە با هیچ کەس لە ئێوە وازنەهێنێ لە یاری کردن بە تیرەکانی) .**

**وە لە ثمامة ی کوڕی عبدالله ی کوڕی ئەنەسەوە، دەفەرمووێ : هاوەڵی بەڕێز ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دادەنیشت، وە فەرشێکی پێدەدرا لەسەری دادەنیشت، وە کوڕەکەشی تیرهاوێژی دەکرد لەبەردەمی، ثمامة دەڵێت: جا ڕۆژێك هات بۆلامان وە ئێمە تیرهاوێژیمان دەکرد .**

**وتی : ئەی ڕۆڵەکانم، زۆر خراپ تیر دە هاوێژن، پاشان کەوانەکەی وەرگرت و تیر هاوێژی کرد، هیچ لە ئامانجەکەی هەڵە نەکردوو هەمووی پێکا .**

٦ - عن عمرو ابن دينار ، سمع جابر ابن عبدالله رضي الله عنهما يقول : قال لي رسول الله ﷺ : (هل تزوجت يا جابر؟) .

قلت : نعم .

قال : (فماذا ، بكراً أم ثيِّباً؟) .

قلت : لا بل ثيِّباً.

قال : (فهلَّا جارية تُلاعبها و تلاعبك . . ) . وذكر الحديث .

واتە : لە عەمروی کوڕی دینارەوە، دەفەرموێ : بیستم جابری کوڕی عبداللە رضي الله عنهما فەرمووی : رسول الله ﷺ پێی ووتم : (ئایا هاوسەرگیریت کردووە ئەی جابر؟ .

ووتم : بەڵێ .

فەرمووی : چ بوو، کچ بوو یان بێوەژن؟ .

ووتم : بێوەژنە .

رسول الله ﷺ فەرمووی : بۆچی کچێکت نەهێنا یاری لەگەڵ بکەی و ئەویش یاریت لەگەڵدا بکات . . . وە فەرموودەکەی تەواو کرد .

---

: رواه احمد (١٥١٩٣) ، والبخاري (٥٣٦٧) ، و مسلم (٧١٥) .

٧ - لە جابرەوە رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ پێی ووتم : ئایا هاوسەرگیریت کردووە؟

ووتم : بەڵێ .

فەرمووی : کچ بوو یان بێوەژن ؟

ووتم : بێوەژنە .

رسول الله ﷺ فەرمووی : بۆچی کچێکت نەهێنا یاری لەگەڵ بکەی و ئەویش یاریت لەگەڵدا بکات ... وە فەرموودەکەی تەواو کرد .

٨ - لە کەعبی کوڕی مالکەوە رضي الله عنه، فەرمووی : لەسەفەرێکدا بووم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، جا ژنم هێنا شەوێکیان، دوای ئەوە بەیانیم کردەوە لەلای رسول الله ﷺ، رسول الله یەك بە یەك پرسیاری لێ دەکردین : ئایا ژنت هێناوە ئەی فلان؟ ئایا هاوسەرگیریت کردووە ئەی فلان؟

پاشان ووتی : ئایا هاوسەرگیریت کردووە ئەی کەعب؟

ووتم : بەڵێ ئەی رسول الله .

ووتی : ئایا کچە یان بێوەژنە؟

ووتم : بێوەژنە .

ووتی : بۆچی کچت نەهێنا .

## محمدی کوڕی حسێن دەڵێت :

**٩** - ئا ئەوەی کە باسم کرد مسوڵمانی عاقڵی ژیر یاری لەگەڵ دەکات، وە ئەوەی جگە لەوانەیە ئەوە باتڵە هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، وە لەگەڵ باتڵیەکەی خراپە و تاوانیشە واجبە لەسەر ئەو کەسەی کە دەیکات ڕێگری لێ بکرێ، وە لەسەر دەسەڵاتداری مسوڵمانە کەوا ڕێگری لێ بکات و سزای بکەرەکە بدات، الله تعالی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات ئەگەر ڕێگری لێ نەکات و لەناوی نەبات و بەتاڵی نەکاتەوە .

## باب - ٢

## باسی حه‌ڕامیه‌تی یاری کردن به تاوڵه وه زۆر توند بوون له‌سه‌ر ئه‌و که‌سه‌ی یاری پێ ده‌کات



**: له (مجله المنار) (٦/ ٣٧٣) : النَّرد : ئه‌وه‌یه که له‌سه‌رده‌می ئێستادا پێی ده‌ووترێ یاری (تاوڵه) ، وه چه‌ند ناوێکی تریشی هه‌یه ده‌گۆڕێ به جیاوازی چۆنیه‌تی یاری پێ کردنه‌که‌ی، وه پێش که‌وتنی به خۆیه‌وه بینیوه له‌و سه‌رده‌مه‌دا هه‌تا هه‌موو کۆڕ و ئاهه‌نگ و یانه‌کانی گرتۆته‌وه .**

### محمدی کوڕی حسین ده‌ڵێت :

١٠ - وه یاری کردن به زاری تاوڵه به‌بێ قومارکردن سه‌رپێچیکردنی الله یه سبحانه وتعالى، واجبه له‌سه‌ر ئه‌و که‌سه‌ی که یاری پێ ده‌کات تۆبه بکات بۆ لای الله تعالى و وازی لێبهێنێت .

جا ئەگەر یاری بە زار کرد و قوماریشی پێ کرد ئەوە تاوانەکەی گەورەترە، لەبەر ئەوەی پارەی قوماری خواردووە وە ئەوەش قومارە، وە بێگومان الله تعالى قوماری قەدەغە کردووە، وە یاری کردن بە زاری تاوڵە، ئەوە قومارە زانایان جیاوازیان نییە تێیدا .

ووتم - محمدی کوڕی حسین - : ئێستا باسی ئەو حەدیسانە دەکەم لەبارەی ئەوەی ووتم بۆئەوەی ئەو کەسەی یاری دەکات بە زاری تاوڵە بترسێ و ڕابچڵەکێ و تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای الله تعالى، جا ئەگەر تەوبە نەکات حاڵی چەند خراپە ئەوکەسە .

---

: تابعی بەڕێز محمدی کوڕی سیرین و مجاهد و عطاء دەربارەی (الميسر) ووتوویانە : هەر شتێ مەترسی تێدابێ، وە لە هەندێ ڕیوایەتدا : بەخت، وە لە هەندێ ڕیوایەتدا : قومار، ئەوە لە میسرە .

ئیمامی مالك دەفەرمووێ : الميسر دوو جۆرە : میسری یاری لەوانە : زاری تاوڵە و شەترەنج و یاریەکانی تر هەمووی، وە میسری قومار : ئەوەیە خەڵکی ماڵ و سامانیان دەخەنە مەترسییە وە لەسەری .

وە بەپێی ئەووتەی ئیمام الميسر دوو مانا لەخۆ دەگرێ :

١ - یاری حەڕام ، بەبێ ماڵ و سامان .

٢ - قوماری حەڕام ، ئەوەیە کە ماڵی تێدایە .

وە ابن تیمیە و ابن القیم یش بۆ ئەوە چوونە، وە هاوشێوەی ئەوە لە أبي سلمە ی کوڕی عبدالرحمن ، ووتی : بە قاسمی کوڕی محمدم وت : المیسر چییە ؟

وتی : هەر شتێك دوورت بخاتەوە لە زیکر و یادی الله تعالی و لە نوێژ ئەوە میسر ( قومار) .

وە ابن تیمیە بۆ ئەوە چووە کەوا خراپی قومار گەورەترە لە خراپەی ڕیبا، لەبەر ئەوەی دوو خراپە لەخۆ دەگرێ : خراپەی خواردنی ماڵ و سامان بە حەڕامی، وە خراپەی یاری و ڕابواردنی حەڕام، کە ڕێگری دەکات لە زیکری الله تعالی وە لە نوێژکردن، وە ڕق و کین و دووبەرەکی دەکەوێتەوە لە نێوانیان، بۆیە المیسر (قومار) حەڕامکراوە پێش حەڕامکردنی ڕیبا .

نەقلێکە لە کتابی **(المیسر و القمار والمسابقات والجوائز : ص ٢٨)**

**١١** - موسى کوڕی عبدالرحمن الخطمي دەڵێ : بیستم محمدی کوڕی کعب پرسیاری لە باوکی کرد لەبارەی المیسر (قومار) ، جا ووتی - کعب - : بیستم رسول الله ﷺ فەرمووی : (من لَعِبَ بالمیسر ثم قام یُصلي فمثله کمثل الذي یتوضَّأ بالقیح ودم الخنزیر، أفتقول : الله یقبل صلاته ؟!) .

واتە : ئەوەی یاری بکات بە قومار دوای ئەوە هەڵبستێ بۆ ئەوەی نوێژ بکات جا نموونەی وەکو کەسێکە کەوا دەست نوێژ دەگرێ بە کێم و جەراحەت و خوێنی بەراز، ئایا دەڵێی : الله نوێژی قبوڵ دەکات ؟!

———

**: رواه احمد (٢٣١٣٨) ، والبخاري في التاريخ (١٢٤٤) ، والفسوي في (المعرفه والتاريخ) (١/ ٢٩٠)**

**١٢** - له محمدى كورِى كعب القرظي پرسيارى له باوكى كرد لەبارەى الميسر ، جا ووتى : رسول الله ﷺ فەرمووى : (لو أن رجلاً قام فتوضَّأ بقيح ودم الخنزير، ثم قام يُصلي ما يبقى ذلک من صلاته؟ فإن كذلك عبتي النرد) .

واته : ئەگەر پیاوێ هەستا و بە کێم و جەڕاحەت و خوێنی بەراز دەست نوێژی گرت، دوای ئەوە هەڵدەستێ بۆ ئەوەی نوێژ بکات چی دەمێنێتەوە لە نوێژەکەی؟ بێگومان یاریکەر بە زاری تاوڵەش بەوشێوەیە .

**١٣** - عن سليمان بن بريده، عن أبيه رضي الله عنه ، عن النبي ﷺ قال : (من لعِبَ بالنَّرد فكأنما صبغ يده في حم الخنزير ودمه) .

واته : هەرکەسێك یاری بکات بە زاری تاوڵە وەکو ئەوە وایە دەستی خۆی خستبێتە ناو گۆشت و خوێنی بەرازەوە .

---

**: رواه مسلم (٢٢٦٠)**، **لە کتابی (ذم الملاهي لابن أبي الدنيا : ٨١)** بە سەنەدێکی حسن لە عبداللەی کوڕی عمرو رضي الله عنهما، دەفەرموێ : یاری کردن بەزاری تاوڵە بە

قومارەوە وەکو ئەوەیە گۆشتی بەراز بخۆی، وە یاری کردن پێی بەبێ قومار وەکو ئەوەیە خۆی چەور کردبێ بە دونگ و چەوری بەراز .

هەروەها ابن تيميه لە (مجموع الفتاوى : ۳۲/ ۲۲٦) دەڵێت : زانراوە کەوا ئەو یاریانە نەفس ئارەزووی دەکات و حەزی لێیەتی وە ئەگەر حەزو خولیای بەهێز بوو بۆی قەرەبوو کردنەوە - پارە - ی تێدەکاتە ناوی هەروەکو چۆن بە عادەت ڕۆیشتووە، وە لە زانایی یاسادانەرە کە ڕێگری بکات لەوەی بانگ دەکات بۆئەوە مادەم بەرژەوەندیەکی باش و زاڵی تێدا نییە، وە ئەوە بە پێچەوانەی ئەو یاریانەیە کە سوود دەبەخشێت : وەکو پێشبڕکێ کردن وزۆرانبازی کردن وهاوشێوەی ئەوانە، بێگومان ئەوانە سوودی زۆریان تێدایە بۆ بەهێزبوونی لاشە بۆیە ڕێگری لێنەکراوە لەبەرئەوە، وە نەفس خووی پێوەناگرێ پارەی پێ دەست بخات .

وە ابن القيم لە (اعلام الموقعين : ۳ / ۱۱٥۷) دەڵێت : وە هەروەها یاری کردن بە زاری تاوڵە ئەوە لە گوناهە گەورەکانە لەبەرچواندنی یاریکەرەکە بەوەی دەستی خۆی کردۆتە ناو خوێن و گۆشتی بەرازەوە، وە لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ماڵ و سامانی پێ خوارد، ئەوا ئەوکاتە لێکچواندنەکە کامل دەبێت، بەڕاستی یاری کردن بە زاری تاوڵە وەکو دەست خستنە ناوە، وە خواردنی ماڵ (قومار) وەکو خواردنی گۆشتی بەرازە .

**١٤** - عن ابن بُريده، عن أبيه، قال : قال رسول الله ﷺ : (من لعِبَ بالنَّردشير فكأنما غَمسَ يده في لحمِ خنزير ودمه) .

واتە : هەرکەسێك یاری بکات بە نەردەشیر وەکو ئەوە وایە دەستی خۆی خستبێتە ناو گۆشت و خوێنی بەرازەوە .

---

**: رواه احمد (٢٢٩٧٩)**

**١٥** - عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه، أن النبي ﷺ قال : (من لَعِبَ بالنردِ فقد عصى الله ورسوله) .

واته : هەرکەسێ یاری بکات بە تاوڵە ئەوە بێگومان سەرپێچی الله و پێغەمبەرەکەی کردووە .

---

**: رواه احمد (١٩٥٢٢)**

**١٦** - عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه، قال : قال رسول الله ﷺ : (من ضرب بالكِعابِ فقد عصى الله ورسوله) .

واته : هەرکەسێ یاری بکات بە تاوڵە ئەوە بێگومان سەرپێچی الله و پێغەمبەرەکەی کردووە .

---

**: رواه احمد (١٩٥٠١) ، وأبو داود (٤٩٣٨)**

١٧ - عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه : عن النبي ﷺ أنه كان يقول : (اجتنبوا هذه الكِعاب الوسومه التي تُزجَرُ زَجراً، فإنها من الميسر) .

واته : دوور بكەونەوە لەو زاره نيشانكراوه كه فرێی دەدرێ، چونكه بێگومان له قوماره .

١٨ - عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه، قال : قال رسول الله ﷺ : (من لَعِبَ بالنردِ فقد عصى الله ورسوله) .

واته : هەركەسێ یاری بكات به تاوڵه ئەوه بێگومان سەرپێچی الله و پێغەمبەرەكەی كردووه .

١٩ - عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه ، قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول : (عصى الله ورسوله، عصى الله ورسوله، عصى الله ورسوله، من ضرب بكعبين يلعب بهما) .

واته : سەرپێچی الله و پێغەمبەرەكەی كردووه، سەرپێچی الله و پێغەمبەرەكەی كردووه، سەرپێچی الله و پێغەمبەرەكەی كردووه، ئەوەی دوو زار هەڵبدا و یاریان پێ بكات .

٢٠ - عن سمره بن جندب رضي الله عنه، قال : قال رسول الله ﷺ : (إياكم وهذه الكِعاب الوسومه التي تُزجَرُ زَجراً، فإنها من الميسر) .

واته : دوور بكەونەوە لەو زارە نيشانكراوە كە فڕێ دەدرێ چونكە بێگومان لە قومارە .

**٢١** - عن ابن عباس رضي الله عنهما، أن رسول الله ﷺ قال : (اتقوا الكعبتين فإنهما ميسر العجم) .

واته : خۆتان بپارێزن لەو دوو زارەی تاوڵە چونكە بێگومان ئەو دووانە قوماری عەجەمن .

**٢٢** - عبداللّه ی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرموێ : ئاگاداربن و دووربكەونەوە لەو دوو زارە نيشانكراوانەی كەوا فڕێ دەدرێن بێگومان لە قومارن .

---

: (رواه البخاري في الأدب المفرد : ١٢٧٠)

**٢٣** - عبداللّه ی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرموێ : ئاگاداربن و دووربكەونەوە لەو زارە نيشانكراوانەی كەوا فڕێ دەدرێن، بێگومان لە قومارە.

**٢٤** - عبداللّهی كوڕی عباس رضي الله عنهما، دەفەرموێ : الميسر : تیری عەرەبە و زاری فارسە .

**٢٥** - نافع دەفەرموێ : کەوا عبداللهی کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەیفەرموو : تاوڵە لە قومارە .

---

: عبداللەی کوڕی عباس لە تیری عەرەب مەبەست پێی ئەوەیە کە عەرەب لە جاهیلی ئەگەربیانویستبا کارێك بکات سێ تیر(قدح) ی دەهێنا هەریەکەیان یەکێ لەم دەستەواژەی لەسەر دەنووسی : (خوایەکەم فەرمانی پێ کردم، خوایەکەم رێگری لێ کردم، بێ ئاگابوو)، دەچوو شتێکی هەڵدەدا بۆ سەریەکێکیان، پاشان هەرکامیانی بۆ دەرچووبا دەچوو بەپێی ئەوە کاری دەکرد .

وه پێشتروونەی ئیمامی مالك مان باسکرد کە دەفەرمووێ : المیسر دوو جۆرە :

١ - میسری یاری لەوانە : زاری تاوڵە و شەترەنج و یاریەککانی ترهەمووی .

٢ - وه میسری قومار: ئەوەیە خەڵکی ماڵ وسامانیان دەخەنە مەترسییە وە لەسەری .

## باب - ٣

## باسكردنی حەڕامیەتی شەترەنج و تاوانی ئەوكەسانەی ئەو یاریە دەكەن



**: ابن القيم له (المنار المنيف في الصحيح والضعيف ص ١٣٠) : له باسی ئەو فەرموودانەی هاتووه دەربارەی شەترەنج ئەوا هیچ فەرموودەیەكی صحیح نییه دەربارەی : وه لەوانه فەرموودەكانی یاریكردن به شەترەنج به مباح - ڕێگەپێدراو - و حەڕامكردن هەمووی درۆ و هەڵبەستراوه به دەمی رسول الله وه ﷺ، بەڵام ئەوەی جێگیر بووه دەربارەی ئەویارییه ڕێگریكردنه له لایەن هاوەڵانەوه رضي الله عنهم .**

**وه ئەوەی هاتووه له سەلەف وپێشەوایانەوه له حەڕامبوونی شەترەنج و ڕێگریكردن لێی :**

**عبداللهی كوڕی عبدالحكم و أشهب ڕیوایەتیان كردووه له ئیمامی مالك وه رحمه الله، له تەفسیری ئەو ئایەته كه الله تعالى دەفەرمویٚ : ﴿فَمَاذَا بَعْدَ الحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَالُ﴾ (یونس : ١٠)**

**ئیمام دەڵێت : یاری كردن به شەترەنج و تاوڵه له گومڕاییه .**

وه یونس ڕیوایهتی كردووه، له ئهشههبهوه دهڵێت : پرسیار له ئیمام مالك كرا له بارهی یاری كردن به شهترهنج؟

ئیمام فهرمووی : هیچ خێرێكی تێدانییه، وه له شته پووچ و باتڵهكانه، وه یاری كردن ههمووی پووچ و باتڵه، بهڕاستی پێویسته بۆ خاوهن عهقڵ و ژیرهكان كه ڕیش و تهمهنهكهی دووریبخاتهوه له شتی ناڕهوا و باتڵ .

وه تابعی بهڕێز ئیمامی زوهری كاتێ پرسیاری لێ كرا لهبارهی شهترهنج ووتی : ئهوه له پووچ و باتڵهكانه وه ڕقیشم لێیهتی .

(البيان والتحصيل : ٨/ ٣٣٧)

وه له (ذم الملاهي لابن ابي الدنيا : ٦١٠٧) له سریجی كوڕی نعمانهوه، دهڵێت : پرسیارم كرد له عبدالله ی كوڕی نافع لهبارهی شهترهنج و تاوڵه؟

جا ووتی : نهگهیشتووم به هیچ یهكێك له زانایانمان ئیللا ڕقی لێبووه، مالك بهم شێوهیه دهفهرمووی .

سریج دهڵێت : وه پرسیارم لێكرد له بارهی وهرگرتنی شایهتیان؟

ووتی : شایهتیان لێ وهرناگیرێ بههیچ شێوهیهك ئیللا ئهگهر بیشارێتهوه و ئاشكرای نهكات - واته بهنهێنی ئهو یارییه بكات - ، مالك بهم شێوهیه بوو .

- وه ئیمام شافعی رحمه الله لهبارهی یاری كردن به شهترهنج دهفهرمووێ : بهڕاستی یارییهكه زۆر له پووچ و باتڵ دهچێت، كهڕاههتی ههیه لهلای من بهڵام بۆم ڕوون نهبۆتهوه حهڕامیهتیهكهی .

- ابن القيم له (اعلام الموقعين : ١ / ٨٩) سهبارهت بهم ووتهی ئیمام شافعی دهڵێت : بێگومان ووتهی ههیه لهسهر كهڕاههتی شهترهنج، وه وهستاوه له حهڕامكردنی، جا

دروست نییه پاڵ بدرێ بۆلای ئەویان بۆلای مەزهەبەکەی کەوا یاری کردن پێی دروسته وڕێگه پێدراوه، بێگومان ئەوئەوقسەیەی نەکردووه، وه دەلالەتیش ناکرێ لەسەری .

وه حەق ئەوەیە کە بووترێ : ئەورِقی لێبووه ووەستاوه لە حەڕام کردنەکەی . جا ئەوه لە کوێی ئەوەیە بووترێ : بەڕاستی مەزهەبەکەی دروستی ئەویاریەوڕێگەپێدانییەتی؟

- ابن القیم لە (الفروسیه) دەڵێت : ئەگەرووردبیتەوه لە چۆنیەتی ئەو مغالباتانه، دەتبینی لەوەدا وەکو ئارەق، کەمێکی داوای زۆری دەکات، وه زۆریەکەی ڕێگری دەکات لەوەی الله تعالی وپێغەمبەرەکەی ﷺ خۆشیان دەوێت، وه دەکەوێتە ناو ئەوەی الله و رسولەکەی توورە دەکات و ڕقیان لێیەتی، ئەگەرنەصێك - لە قورئان و سوننەت - نەبوایە بۆحەڕامکردنەکەی ئەوا بنچینەی شەریعەت وسەرچاوەکەی وه ئەوەی کە لە خۆی گرتووە لە حیکمەت وبەرژەوەندییەکان وه نەبوونی جیاوازی لەنێوان دوو هاوشێوە : حەڕامیەتی ئەو یاریە و ڕێگری لێگرتنی واجب دەکات، چجای ئەوەی قورئان و سوننەت دەلالەتی کردووه لەسەری، بێگومان نەص و قیاس یەکدەنگن لە سەر حەڕامیەتی ئەو یارییە، وه پێشەوای ئیمانداران علی کوڕی ابو طالب رضي الله عنه ناوی لە شەترەنج ناوه بت وپەیکەر، کاتێ تێپەڕی بەلای کۆمەڵێك یاریان بە شەترەنج دەکرد، جا ووتی : ئەم بت وپەیکەرانە چین ئێوه لەبەریان کەوتوون؟!

وه مێزوداره‌کەی هەڵگەڕاندەوه بەسەریان .

وه نەزانراوە یەکێك لە هاوەڵان حەلاڵی کردبێ وبەدروستی زانیبێ، وه نە یاری پێ کردبێ، بێگومان الله عزَّوَجَل پەنایدابوون وئەوانی دوورخستبووەوه لەویارییە، وه هەموو ئەوەی پاڵ دەدرێ بۆلای یەکێك لەوان گوایە ئەویارییەی کردووه وەکو أبي هريره رضي الله عنه ئەوه درۆ و بوختانە بەسەر هاوەڵانەوه رضي الله عنهم، نکوڵی لێدەکات هەرکەسێ زانابێ بە ژیانی هاوەڵان، وه هەرکەسێ شارەزا بێ لە ئاثار.

وه چۆن ڕێگهدهدن باشترینی سهردهم وباشترین دروستكراو دوای رسول الله ﷺ یاری كردن به شتێك ڕێگه گرتنی له زیكرو یادی الله تعالى وه له نوێژ گهورهترو زیاتره له ڕێگری كردنی عارهق ئهگهر ڕۆچووبێت تێیدا یاریكهرهكه و ئاڵوودهبووبێت پێی، وه و اقع شایهتی ئهوهیه .

وه چۆن شهرع دانهر- والله اعلم مهبهست پێی پێغهمبهره ﷺ - ، تاوڵه حهڕام دهكات و ڕێگهدهدات به یاری كردن به شهترهنج، له كاتێكدا چهند قاتی ئهو خراپهی زیاتره !

وه چۆن گومان دهبرێ به رسول الله ﷺ وهاوهڵانی ڕێگه بدهن به قوماری عهجهم - به جگه له عهرهب دهووترێ عجم - ، لهكاتێكدا الله عزَّوَجَل ورسولهكهی زیاترڕقیان لێیه له قوماری عهرهب، بهڵكو شهترهنج پاشا وسوڵتانی جۆرهكانی قوماره، ئهگهریاریكردن به تاوڵه وهكو ئهوه و ابێ كهسهكه دهستی خۆی خستبێته ناو گۆشت و خوێنی بهرازهوه، ئهی دهبێ حاڵی یاریكهربه شهترهنج چۆن بێ؟!

وه ئهوه چیه تهنها لهبابی ئاگادارکرنهوه نهبێ له گوناهی كهمتربهسهرگوناهی زیاتر.

وه ئهگهر ئهو كهسهی یاری دهكات به تاوڵه سهرپێچی الله عزَّوَجَل ورسولهكهی كردبێ لهگهڵ كهمی خراپهی زار و تاوڵه، جا چۆن ناوی سهرپێچیكار بۆ الله تعالى و رسولهكهی لێدهكرێتهوه لهو كهسهی كه یاری دهكات به شهترهنج لهگهڵ زۆری و گهورهیی خراپیهكهی، وه ڕێگرییهكهی لهوهی الله تعالى و رسولهكهی ﷺ خۆشیان دهوێ له كاری چاكه، وه گرتنی بیرو هۆشی یاریكهرهكه و مهشغوڵ بوونی دڵ و ههموو ئهندامهكانی لاشهی، وه بهفیرۆدانی تهمهنی و بانگكردنی كهمهكهی بۆ زۆرهكهی، وهكو بانگكردنی كهمێكی عارهق بۆ زۆرهكهی - و اته ئاڵوودهبوون پێی والله اعلم - ، وه حهزو ئارهزووی نهفس تێیدا به ماڵ لهسهرووی ئارهزووهكهیهتی بهبێ ماڵ .

ئەگەر هیچ خراپەیەك لە یارییەكەدا نەبوایە جگە لەوەی پاساوێكی نزیكە بۆ گەیشتنە خواردنی ماڵی حەڕام بە قومار، ئەوا حەڕامیەتیەكەی دیاریكراوە لە شەریعەت، چجای ئەوەی لە خراپە دەركەوتووەكانی كە تەنها یاریكردن پێی حەڕام كردنی پێویست دەكات؟!

وە چۆن گومان دەبردرێ بە شەریعەت كەوا ڕێگەدەدات بەوەی دڵ بەلاڕێدا دەبات و مەشغولی دەكات لە چاكسازی و بەرژەوەندی دین و دونیای، وە ڕق و دوژمنایەتی دەچێنێ لەنێوان ئەو كەسانەی یاری پێ دەكەن، وە كەمێك یاری كردن پێی داوای زیاتر دەكات، وە ئەوە دەكات بە عەقڵ و هۆش كە سەرخۆشكەر پێی دەكات بگرە خراپتریش، وە لەبەرئەوە یاریكەرەكەی دەكەوێتە ڕوو بەسەریدا وەكو كەوتنەڕووی عارەق خۆر بۆ سەرعارەقەكەی، بگرە خراپتریش، چونكە ئەو شەرم ناكات و ناترسێت وەكو چۆن عارەق خۆر شەرم دەكات، وە هەردووكیان چوێندراون بە كەسێك كەوتبێتە سەرڕوو بۆ سەربت - واتە: وەكو چۆن بت پەرستەكە سوجدە دەبات و دەكەوێتە سەرزەوی بۆ بتەكەی ئاواش ئەو كەسانەی كە یاری تاوڵە و شەترەنج دەكەن بە چەند سەعات سەریان لەسەرئەو یارییەیە و دوورن لەزیكرو یادی الله تعالى و نوێژ، درۆی لەسەردەكەن و سوێندی لەسەردەخۆن و هەتا ڕقیان لەیەكتری دەبتەوە والله اعلم الله تعالى هەموو لایكمان بپارێزێت -.

ئەمما ئەو كەسەی یاری دەكات بە شەترەنج: بێگومان بە صەحیحی هاتووە لە پێشەوای ئیمانداران علی كوڕی ابو طالبەوە رضي الله عنه كەوا چواندوویەتی بە كەسێك كە كەوتۆتە ڕوو بەسەربتێكەوە.

وە دەربارەی عارەق خۆر: لە مسند ی ئیمام ئەحمەد هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كەوا فەرموویەتی: (شارب الخمر كعابد وثن).

واتە: عارەق خۆر وەكو بت پەرست وایە.

وه به صهحیحی هاتووه ڕێگریکردن له یاری شهترهنج لهلایهن عبد الله ی کوڕی عباس و عبدالله ی کوڕی عمر رضي الله عنهم، وه نهزانراوه هیچ یهك له هاوهڵان پێچهوانهیان بکهن لهو بابهته بههیچ شێوهیهك.. هتد.

وه سهیری کتابی (ذم الملاهي لابن أبي الدنيا ـ باب في الشطرنج)، وه (مصنف لابن ابي شيبه ـ في اللعب باشطرنج) بکه.

**٢٦** - له ابن ابي ليلى، دهڵێت: ئیمامی على کوڕی ابو طالب رضي الله عنه فهرمووی: بهڕاستی هاوهڵانی شهترهنج له درۆزنترینی خهڵکین، یهکیان دهڵێت: کوشتم، وه نهشیکوشتووه.

**٢٧** - له حکم ەوە، له على کوڕی ابو طالبهوه رضي الله عنه، دهفهرمووێ: ئهو کهسهی سهیری یاری شهترهنج دهکات وهکو ئهوه وایه سهیری گۆشتی بهرازی کردبێت، وه ئهوهی ههڵیدهگێڕێتهوه وهکو ئهوه وایه گۆشتی بهرازی ههڵگێڕابێتهوه.

**٢٨** - له مهیسهرهی نههدی، دهڵێت: ئیمامی على رضي الله عنه تێپهڕی بهلای کۆمهڵێك یاری شهترهنجیان دهکرد، ئیمامی علي رضي الله عنه وتی: ئهم بت و پهیکهرانه چین ئێوه لهبهریان کهوتوون.

---

: له (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) ی خلال (١٤٩) مهنا دهڵێت:

پرسیارم كرد له باوكی عبدالله (ئیمام احمد) لەبارەی یاری كردن به شەترەنج، هیچ شتێك لەبارەیەوە دەزانی؟

ئیمام احمد وتی : نازانم تەنها ووتەی ئیمام علی نەبێت رضي الله عنه .

ووتم : چۆنه ئەوە؟ بیگێڕەوە .

جا بۆی گێڕامەوە له جگه له كەسێكەوە : وكیع، له فضیلی كوڕی غزوان، له مەیسەرەی كوڕی حبیب الفهري، دەڵێت : ئیمامی علی رضي الله عنه تێپەڕی بەلای كۆمەڵێك یاری شەترەنجیان دەكرد .

ئیمامی علي رضي الله عنه ووتی : ئەم بت و پەیكەرانه چین ئێوه لەبەریان كەوتوون؟!

جا پرسیارم له احمد كرد ووتم : مەیسەره به علي گەیشتووه؟ ووتی : نا ، جا ووتم : خەڵكی كوێیه میسره؟

ووتی : كوفه، شوعبه ڕیوایەتی لێوه كردووه .

ووتم : شوعبه له مەیسەرەی بیستووه؟ ووتی : بەڵێ .

مهنا دەڵێت جارێكی تر هەمان پرسیارم كردەوه له احمد، ووتم : كەسێكی تر هەبووه كه ڕقی له شەترەنج بووبێ جگه له علي رضي الله عنه؟

ووتی : بەڵێ .

ووتم : كێ؟

ووتی : عبداللهی كوڕی عمر رضي الله عنه .

ووتم : كێ گێڕاویەتیەوە؟

ووتی : أبو بدر شجاع ، له عبداللەی کوڕی عمرەوە . بەوشێوەیەی وت .

نافع له سەنەدەکەدا نییه : بەڕاستی عبداللەی کوڕی عمر رضي الله عنه یاری کردن به شەترەنجی ڕق لێبووه و پێی ناخۆش بووه .

- ابن رجب له (جامع العلوم والحكم : ٢/ ٤٥٨) دەڵێت : وه بەهەمان شێوه قوماریش دەبێته بەربەست له زیکری الله عزَّوَجَل و نوێژ کردن، چونکه خاوەنەکەی دەکەوێته ڕوو بۆی به دڵی، وه مەشغوڵ دەبێت پێی له جیاتی هەموو کاره چاکه و گرنگەکانی هەتاوەکو خەریك نابێت باسی بکات لەبەر ڕۆچوون و مەشغوڵ بوونی بەو یارییە، جا لەبەر ئەوە ئیمامی علي رضي الله عنه فەرمووی کاتێ تێپەڕی بەلای کۆمەڵێك یاری شەترەنجیان دەکرد : ئەم بت و پەیکەرانه چین ئێوه لەبەریان کەوتوون؟، بۆیه چواندنی به کەوتنه سەرڕووەکان لەسەربت .

وه ئەوانه هەمووی پێچەوانەی ئەوەن که الله تعالى بەندەکانی بۆ درووست کردووه له بەتاڵکردنی دڵەکانیان بۆ ناسینی الله عزَّوَجَل و خۆشویستنی و ترسان لێی و یادکردنی و موناجاتی و پاڕانەوە لێی و گەڕاندنەوەی داواکانی بۆ لای الله، جا هەرشتێك ببێته بەربەست له نێوان بەنده و ئەوانەدا، وه بەنده هیچ پێویستی بەوە نییه ئەوکاره بکات، بەڵکو زیانێکی ڕوون و ئاشکرای بۆ هەبوو، ئەوە حەرامە، وه ڕیوایەت کراوه له ئیمامی عەلي وه رضي الله عنه ووتوویەتی بەو کەسانەی کەوا بینی یاری دەکەن به شەترەنج : بۆئەوە دروست نەکراون، ئا لێرەوە دەزانرێ کەوا میسر- قومار- حەرامکراوە، جیاوازی نییه لەسەرپاره بێت یان نا، وه به ڕاستی یاری شەترەنج وەکو تاوڵە و ایه یان خراپتر لەو، لەبەر ئەوەی خاوەنەکانی مەشغوڵ دەکات له زیکر و یادی الله تعالى و نوێژ زیاتر له تاوڵه .

**٢٩** - بۆی گێڕاینەوە عبداللە ی کوڕی عمر، دەڵێت : پرسیار کرا لە عبداللە ی کوڕی عمر رضي الله عنه لە بارەی شەترەنج؟

جا ووتی : ئەوە خراپترە لە تاوڵە .

**٣٠** - بۆی گێڕاینەوە عبیداللە ی کوڕی عمر، ووتی : ووترا بە قاسمی کوڕی محمد : ئەو تاوڵەیە کەڕاهەتی هەیە لای تۆ؟

جا ووتی : بەڵێ .

ووتی : شەترەنجیش؟

ووتی : هەر شتێك ڕێگری بکات لە زیکری الله عزَّوَجَل ئەوە لە میسر - قومار - ە .

**٣١** - لە عبیداللەوە، پرسیار کرا لە قاسم لەبارەی یاریکردن بە شەترەنج و تاوڵە .

قاسم ووتی : هەر شتێك ڕێگری بکات لە زیکری الله عزَّوَجَل ئەوە لە میسر ە . یان وەکو ئەوەی أبو سعيد الأشج ووتی .

**٣٢** - لە عبیداللە ی کوڕی عمرەوە، کەوا بیستی زەیدی کوڕی عبیداللە، وە ئەو بە قاسمی دەووت : تاوڵە لە قومارە، ئایا وادەبینی شەترەنجیش هەر لە قومارە؟

قاسم ووتی : هەر شتێك ڕێگری بكات له زیكری الله عزَّوَجَل و له نوێژ ئەوە لە میسر ه . یان وەكو ئەوەی أبو سعید الأشج ووتی .

**٣٣** - عن أبي هريرة رضي الله عنه، قال : قال رسول الله ﷺ : (إذا مررتم بهؤلاء الذين يلعبون الأزلام، الشطرنج و النرد وما كان من اللهو، فلا تسلموا عليهم، فإن سلموا عليكم فلا تردوا عليهم، فإنهم إذا اجتمعوا وأكبوا عليها، جاء ابليس - أخزاه الله - بجنوده فأحدق بهم، كلما ذهب رجلٌ يصرف بصره عن الشطرنج لكز في ثغره، و جاءت الملائكة من وراء ذلك فأحدقوا بهم، ولم يدنوا منهم، فما يزالون يلعنونهم حتى يتفرَّقون عنها حين يتفرَّقون كالكلاب اجتمعت على جيفة فأكلت منها حتى ملأت بطونها ثم تفرَّقت) .

واته : له أبو هريرەوە رضي الله عنه، ووتی : نێردراوی الله ﷺ دەفەرمووێ : ئەگەر تێپەڕین بەلای ئەوانەی یاری بەخت دەكەن، شەترەنج و تاوڵە و ئەوەی لەو جۆرە یاریانەیە، ئەوا سڵاویان لێ مەكەن، ئەگەر سڵاویان لە ئێوە كرد وەڵامیان مەدەنەوە، چونكە كاتێ كۆدەبنەوە و سەریان دەخەنە سەری، ابلیس - أخزاه الله - دێت بە سوپاكەیەوە چاویان تێ دەبڕێت، هەركاتێ پیاوێك دەڕوات چاوی لادەدات لە شەترەنجەكە بەلێدانێكی توند لەدەمی دەدات و كونی دەكات، لە دوای ئەوە فریشتە دێن و چاویان تێ دەبڕن، وە لێیان نزیك نابنەوە، جا بەردەوام نەفرەتیان لێدەكەن هەتاوەكو لێك جیادەبنەوە كاتێ

لێك جیادەبنەوە وەكو كۆبوونەوەی سەگ لەسەر كەلاكێكی بۆگەن جا لێی دەخۆن هەتا سكیان پڕ دەكەن دواى ئەوە جیا دەبنەوە) .

---

: الديلمي لە (الفردوس : ١٠٤٥) ڕیو ایەتی كردووە .

لە (شعب الإيمان : ٦١٠٣) لە عیسای كوڕی صبیح مەولای عمروی كوڕی عبیدەی قازی، دەڵێت : لەگەڵ ئەیوب السختیانی بووم، جا بینی كۆمەڵێك خەڵك یاری دەكەن بە شەترەنج، جا بە محمدی كوڕی منكدری ووت : ئەوەی یاری بكات بە زاری تاوڵە ئەوا سەرپێچی الله عزَّوَجَل و پێغەمبەرەكەی كردووە .

عمروی كوڕی عبیدە پێی ووت : ئەوە تاوڵە نییە ئەوە شەترەنجە .

ئەیوب ووتی : تاوڵە و شەترەنج یەكسانن .

وە لە (ذم الملاهي : ٩٦) معنی كوڕی عیسا دەڵێت : ئیمامی مالكی كوڕی ئەنەس دەفەرمووێ : شەترەنج لە تاوڵەیە، پێمان گەیشتووە لە عبداللهى كوڕی عباسەوە، كەوا ماڵی هەتیوێكی گرتە دەست جا سوتاندی - تاوڵە یان شەترەنجەكە والله اعلم - .

وە لە (جامع ابن عبدالحكم : ١٠٨) : ابن وهب دەڵێت : وە بیستم ئیمامی مالك ڕقی دەبووەوە لە هەموو شتێك كە یاری پێ دەكرێ لە تەپڵ و چواردە - جۆرە یارییەكە - .

جا ووترا پێی : ئەی شەترەنج ؟

ئیمام مالك ووتی : ئەوە خراپترە لە تەپڵ، وە ئەوە لەلای ئێمە خراپترە لە جگە لە خۆی.

وه لە مالك م بیست كە پرسیاری لێكرا لەبارەی یاری كردن بە شەترەنج ئایا كەڕاهەتی هەیە - رقت لێیەتی - ؟

ئیمام مالك فەرمووی : بەڵێ .

## باب - ٤

### باسكردنی ئەو كەسەی تاوڵە و داری چوارده خەت دەشكێنێت و دەیسوتێنێت، وە سڵاویش ناكرێ لەو كەوسەی كە یاری پێدەكات وە یاری شەترەنج دەكات و هاوشێوەی ئەوانە



**محمدی کوڕی حسین دەڵێت :**

**٣٤** - كۆمەڵێك لە هاوەڵان و شوێنكەوتووان تاوڵە و شەترەنج و چوارده خەت - سێ ڕسكێنە و نۆ ڕسكێنە یان دامە یارییەكی لەو شێوەیە والله اعلم - ، دەیاشكاند، وە هەرچی هاوشێوەی ئەوانە لە میسر، وە ئەوەش قوماره، وە سڵاویان نەدەكرد لەسەر ئەوانەی ئەو جۆرە یاریانەیان دەكرد، وە خانووێكیان بە كرێ نەدەگرت ئەگەر بیانزانیایە كە شتێك لە قوماری تێدا دەكرێ بە تاوڵە و شەترەنج، وە ئینكاریان لێدەكرد بە توندترین شێوە .

**٣٥** - لە زُبید ی كوڕی الصلت، كەوا بیستی لە ئیمامی عثمان ی كوڕی عفان رضي الله عنه، لەسەر مینبەر دەیفەرموو : ئەی خەڵكینە، دووربكەونەوە لە الميسر - زُبید دەڵێت : تاوڵە - وە بەڕاستی بۆم باسكراوە

کەوا لە لەناو هەندێك ماڵی ئێوەدا هەیە، جا ئەوەی هەیەتی لە ماڵەکەی بابیسوتێنێ یان بیشکێنێ .

زُيد دەڵێت : پاشان جارێکی تر فەرموویەوە ئیمامی عثمان لەسەر مینبەر : ئەی خەڵکینە، بێگومان من پێم گووتن دەربارەی ئەو تاوڵەیە، بەڵام نەمبینی فرێی بدەن، وە بێگومان ویستم فەرمان بکەم بە کۆکردنەوەی چیلکە دار پاشان بیانئێرم بۆ سەر ماڵی ئەو خەڵکانە و بیانسوتێنن بەسەریان.

**٣٦** - لە زُیدی کوڕی الصلت، کەوا بیستی لە ئیمامی عثمانی کوڕی عفان رضي الله عنه، کەوا ڕۆژێکیان هەستایە سەر مینبەر و فەرمووی :

ئەی خەڵکینە، هەواڵم پێدراوە کەوا ئەو الميسره زۆر بووە لەناو ماڵەکانتان ، جا با لەهیچ ماڵێکدا نەبێت ئیللا بیسوتێنێن یان بیشکێنن .

دوای ئەوە ڕاوەستا ئەوەندەی الله تعالى ویستی لێبوو ڕابوەستێ : پاشان هەستاوە و فەرمووی : ئەی خەڵکینە، بێگومان من پێم گووتن دەربارەی ئەو الميسره بەڵام نەمبینی شتێك بکەن، وە من سوێند دەخۆم بە الله عزَّوَجَل بێگومان ویستم فەرمان بکەم بە کۆکردنەوەی چیلکە دار و پوش بۆ ئەو ماڵانەی ئەو جۆرە یاریانەی تێدایە، پاشان بیسوتێنن وە هەموو ئەوەی تێیدایە .

**٣٧** - بۆی گێڕاینەوە ربیعەی کوڕی کلثوم، لە باوکیەوە ، دەڵێت : عبداللهی کوڕی زبیر ووتاری بۆ داین، جا فەرمووی : ئەی خەڵکی مەککە،

پێم گەیشتووە کە پیاوان یاری دەکەن بە یاریەك پێی دەووترێ : النردەشیر - تاوڵە و زاری تاوڵە - ، وە بێگومان الله عزَّوَجَل فەرموویەتی لە کتابەکەی : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ (المائدة) .

واتە : ئەی گەلی خاوەن باوەڕ، بێگومانبن کە عارەق خۆریی و قومار بازیی و کاغەزی - یانەسیب - و ئەو بەردەی حەیوانی بتەکانی لەسەر سەر دەبڕێ بۆ بتەکان و فاڵگرتنەوە بۆ دەرکەوتنی بارێکی چاك، یان خراپ، یان بۆ تاقیکردنەوەی بەخت، وەك عادەت و باوبوو، ئەمانە گشتی پیسن و لەکاری شەیتانن، دەسا ئێوە خۆتانی لێ دووربگرن، تا بەڵکو لە دنیاو لەقیامەتدا ڕزگارو بەختەوەربن .

وە من سوێند دەخۆم بە الله تعالى هەرکەسێك بهێنرێ بۆم کەوا ئەو یارییەی کردبێ ئەوا سزای دەدەم لە موو و پێستی، وە جلیش دەدەم بەو کەسەی ئەو جۆرە کەسانەم بۆ بهێنێ کە ئەو یارییە دەکەن .

**٣٨** - بۆی گێڕاینەوە علقمة ی کوڕی باوکی علقمة، لە دایکیەوە : کەوا دایکە عائشة رضي الله عنها هەواڵی پێگەیشت کەوا خەڵکانێك لە ماڵەکەی یاری تاوڵە دەکەن، دایکە عائیشە فەرمانی بە خزمەتکارەکەی کرد کە فڕێی بدات - واتە تاوڵەکە - لە ماڵەکەی .

**٣٩** - لە علقمة ی کوڕی باوکی علقمة، لە دایکیەوە : کەوا دایکە عائشة رضي الله عنها : هەواڵی پێگەیشت کەوا خەڵکانێك لەماڵەکەی کە نیشتەجێبوون تێیدا تاوڵەیان لەلایە، دایکە عائیشة رضي الله عنها ناردی بەدوایان : ئەگەر فرێی نەدەن - تاوڵەکە - ئەوا دەرتان دەکەم لە ماڵەکەم، وە ئینکاری کرد ئەو کارەی لێ کردن .

**٤٠** - لە نافع ەوە : کەوا عبداللهی کوڕی عمر رضي الله عنهما ئەگەر بینیبایە یەکێك لە خانەوادەکەی و منداڵەکانی یاری دەکات بە تاوڵە یان بە چواردە ئەوا لێی دەشکاندن، وە لێی دەدان و لەو شوێنە هەڵیدەستاندن .

نافع دەڵێت : وە ئەو بینی کەسێك لە خانەوادەکەی یاری چواردە دەکات، جا لەسەریدا بە دارەکە هەتا شکاندی - بوخاری لە (**الأدب المفرد** ١٣١١) ڕیوایەتی کردووە - .

**٤١** - لە نافع ەوە ، دەڵێت : کەوا عبداللهی کوڕی عمر رضي الله عنهما ئەگەر ببینیایە یەکێک لە خانەوادەکەی یاری دەکات بە تاوڵە لێی وەردەگرت و دەیشکاند و دەیسوتاند ، وە لێی دەدان .

**٤٢** - لە مجاهدەوە، دەڵێت : عبداللهی کوڕی عمر رضي الله عنهما تێپەڕی بەلای کۆمەڵێك یاری چواردەیان دەکرد، جا سوتاندی بە ئاگر .

**٤٣** - له أسلم المنقري، دەڵێت : تابعی بەڕێز سعیدی کوڕی جبیر رحمه الله ئەگەر بڕۆیشتایە بەلای هاوەڵانی تاوڵە - ئەوانەی یاری تاوڵە دەکەن - سڵاوی لێ نەدەکردن .

**٤٤** - له زیادی کوڕی حُدیر ـەوە : کەوا تێپەڕی بەلای کۆمەڵێك یاری تاوڵەیان دەکرد جا سەلامی لێکردن وە ئەو نەیزانی - واتە نەیزانی یاری تاوڵەی دەکەن والله اعلم - ، پاشان گەڕایەوە، جا ووتی : سڵاوەکەم بۆ بگەڕێننەوە - واتە پەشیمانبوویەوە لە سڵاو لێکردنیان والله اعلم - .

**٤٥** - بۆی گێڕاینەوە إسحاقی کوڕی منصور الکوسج، دەڵێت : ووتم بە ئیمامی احمدی کوڕی حنبل رحمه الله : پیاوێك تێدەپەڕێ بەلای کۆمەڵێك کە یاری تاوڵە و شەترەنج دەکەن، سەلامیان لێدەکات؟

ئیمام أحمد ووتی : ئەوانە شایستەی ئەوە نین سەلامیان لێبکرێ .

ئیمام إسحاقی کوڕی راهویە دەڵێت : نەخێر، بەڵام ئەگەر ویستی بۆیان ڕوونبکاتەوە لەوەی تێیدان - واتە بیەوێ ئامۆژگاریان بکات وازبهێنن لەو یاریانە - ، سەلامیان لێدەکات، پاشان ئەمر دەکات بە چاکە و ڕێگری دەکات لە خراپە، وە ئەگەر ئەوەی نەویست، ئەوا نەخێر، وە ڕێزیشیان نییە .

---

**: لە (البیان والتحصیل - ١٧/ ٥٧٧) : پرسیارکرا لە ئیمام مالك لەبارەی پیاوێک یاری چواردە دەکات لەگەڵ ژنەکەی لە ماڵەوە .**

ئیمام فەرمووی : ئەوەم پێ خۆش نییە ، وە یاری كردن ئیشی ئیماندار نییە، لەبەر فەرمووده‌ی الله تبارك وتعالى : ﴿فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ﴾ (يُونس : ٣٢) .

واتە : جا ئیتر بەدەر لەگومڕایی - پاش حەق وراستیی كە هەرلەپەرستنی خوادایە - چیترهەیە؟ .

ئیمامی مالك ڕیوایەتی كردووە لە (الموطأ - ٧) (باب ما جاء في النرد) بە زیادەی :

یەحیا دەڵێت : بیستم مالك دەیوت : خێر نییە لە شەترەنجدا، وە بە كەڕاهەتی دادەنا، وە بیستم پێی ناخۆش بوو یاری كردن پێی، وە بە جگە لەویش لە باتڵ، وە ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە :

﴿فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ﴾ (يُونس : ٣٢) .

لە (زوائد الزهد) ی عبدالله ی كوڕی أحمد (١٥٦٨) بشری كوڕی حارث دەڵێت : پرسیارم كرد لە المعافى لەبارەی پیاوێك تێدەپەڕێ بەلای كۆمەڵێك یاری دەكەن بە شەترەنج ئایا بۆی هەیە سەلامیان لێبكات؟

المعافى ووتی : نەخێر، بەڕاستی سوفیان دەڵێت : سەلامیان لێدەكات وە ئەمر دەكات - بە چاكە - .

المعافى دەڵێت : ئەگەرئەمرنەكات بە چاكە ئەوا سەلامیان لێناكات .

لە (الأدب المفرد) ی ئیمامی بوخاری (باب لا يُسلِّم على فاسق)، وە باسی كردووە بە سەنەدی خۆی لە باوكی رُزیق، كەوا بیستی علي كوڕی عبدالله شەترەنجی پێ ناخۆش بوو - بە كەڕاهەتی دادەنا - ، وە دەیووت : سەلام مەكەن لەوكەسەی كە یاری شەترەنج دەكات، وە ئەوە لە الميسره.

- وه‌ پرسیار كرا له‌ ئیمامی مالك له‌باره‌ی پیاوێك تێده‌په‌ڕێ به‌لای كۆمه‌ڵێك یاری ده‌كه‌ن به‌ شه‌ترەنج و تاوڵه‌؟

نا وتی : سه‌لامیان لێناكرێ، ئه‌وه‌ له‌ ڕه‌وشتی ئه‌هلی ئیسلام نییه‌، له‌به‌رئه‌وه‌ی ئه‌وه‌ یاری و گاڵته‌وگه‌په‌، وه‌ الله تعالى دروستكراوه‌كانی دروست كردووه‌ بۆ ئه‌وه‌ی بیپه‌رستن، وه‌ خه‌ریك بن به‌ گوێڕایه‌ڵی ئه‌و، وه‌ خۆیان پاك ڕابگرن له‌ گاڵته‌ و یاری، ئایا نه‌تبیستووه‌ فه‌رمایشتی الله تعالى : ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾ (المُؤمنون) .

و اته‌ : ئایا پێتان و ابوو به‌ گه‌مه‌و بێ هووده‌ دروستمان كردوون .

وه‌ له‌ (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر : ١٤٩) ى كه‌ هی ئیمام الخلال ه‌، له‌ حه‌سه‌نی كوڕی ثواب، ده‌ڵێت : بیستم له‌ باوكی عبدالله - ئیمام أحمد - ، وه‌ پیاوێك پێی ووت وه‌ من ده‌مبیست : چی ده‌ڵێی له‌باره‌ی كۆمه‌ڵێك یاری شه‌ترەنج ده‌كه‌ن وه‌ منیش ده‌چم بۆ لایان له‌به‌رپێویستیه‌ك، سه‌لامیان لێبكه‌م؟

ئیمام ووتی : ڕیگریان لێ بكه‌، ئامۆژگاریان بكه‌ .

وه‌ له‌ هه‌مان كتێبی ئیمامی الخلال به‌ ئه‌ثه‌ری (١٥٠) له‌ عبدالملكی كوڕی عبدالحمید : كه‌وا كۆیله‌یه‌ك پرسیاری كرد له‌ باوكی عبدالله، ووتی : به‌ڕاستی خاوه‌نه‌كه‌ی ده‌ینێرێت به‌لای كۆمه‌ڵێك یاری شه‌ترەنج ده‌كه‌ن، جا سه‌لامیان لێبكه‌م یان نا؟

ئیمام پێی ووت : ئامۆژگاریان بكه‌، پێیان بڵێ : ئه‌وه‌ حه‌ڵاڵ نییه‌ بۆتان و ڕێگه‌پێدراو نییه‌، فه‌رمانیان پێ بكه‌ به‌ چاكه‌ .

جا كۆیله‌كه‌ ووته‌كه‌ی دووباره‌ی كردەوه‌، ئیمامیش هه‌مان قسه‌ی دووباره‌ كردەوه‌ .

- وه له‌هه‌مان كتێبی ئیمامی الخلال له ئه‌ثه‌ری (١٥١) له أبي طالبه‌وه كه‌وا پرسیاری كرد له باوكی عبدالله (ئیمام أحمد) : تێده‌په‌ڕم به‌لای كۆمه‌ڵێك یاری شه‌تره‌نج ده‌كه‌ن هه‌ڵیبگه‌ڕێنمه‌وه لێیان یان ڕێگریان لێبكه‌م؟

ئیمام ووتی : تاوڵه خراپتره و شه‌تره‌نجیش به‌هه‌مان شێوه .

جا ووتم : ئه‌ی ئه‌گه‌رشاردیانه‌وه یان خستیانه پشتیان؟

ئیمام ووتی : ڕووبه‌ڕوویان مه‌به‌وه ئه‌گه‌رشاردیانه‌وه یان دایان پۆشت له تۆ .

وه له (مسائل أبي داود : ١٨٠٩) له یزیدی كوڕی یوسف، كه‌وا پرسیاری كرد له یزیدی بن أبي حبیب له‌باره‌ی شه‌تره‌نج؟

جا ووتی : ئه‌گه‌رتێبپه‌ڕم به‌لای كۆمه‌ڵێك یاری بكه‌ن به شه‌تره‌نج، ئه‌وا سه‌لامیان لێناكه‌م .

وه له (مسائل أبو داود : ١٨٠١) أبو داود ده‌ڵێت : بیستم ئیمامی أحمد پرسیاری لێكرا له‌باره‌ی پیاوێك تێپه‌ڕی به‌لای كۆمه‌ڵێك یاری شه‌تره‌نجیان ده‌كرد،

جا ڕێگری لێكردن به‌ڵام وازیان نه‌هێنا، جا شه‌تره‌نجه‌كه‌ی گرت و فڕێیدا؟

ئیمام ووتی : زۆرباشی كردووه .

ووترا به ئیمام أحمد : هیچ شتێكی له‌سه‌رنییه - پاره‌ی شه‌تره‌نجه‌كه والله اعلم - ؟

ووتی : نه‌خێر.

ووترا به ئیمام أحمد - وه من ده‌مبیست - : وه به‌هه‌مان شێوه ئه‌گه‌ر عودێك یان طنبورێكی شكاند؟

ئیمام ووتی : به‌ڵێ .

دەبینین سەلەف نەك لەسەرکردنی یاریەکە بەڵکو لەسەرخودی ئەوکەسەش کە یاریەکەی کردووە توند بوونە، تەنانەت سەلامکردنیش لێیان دەبێت بۆ ئەوە بێت کە ڕێنماییان بکەی، شتانێکی تیایە دەکرێ بۆت نوێ بێت .

## باب - ٥

## لە باسی ئەو زانایانەی ووتوویانە : قومار هەمووی حەڕامە تەنانەت یاریکردنی منداڵ بە گوێز و زار و جگە لەمانە



**: قومار: ئەوەیە نیشانەی مەترسی یان ڕكابەری هەبێت لەنێوان دوو كەسەكە (دژەكان)، ئەگەریەكیان بردیەوە و قازانجی بەدەست هێنا ئەوا بەرامبەرەكەی دەدۆڕێت وپێدەبژێرێت، ڕوونتر: قومارئەوەیە هەریاریەك لەسەرماڵ وپارە بێت كە براوە وەرێدەگرێت لە دۆڕاو، كەواتە پێبژاردنی ماڵ و پارەیە لەلایەن دوو دژەكە لەسەرئەوەی بردیەوە ئەوا ماڵی دۆڕاوەكە بۆخۆی دەبات . نەقلێكە لە كتابی (الميسر والقمار : ص٣١) .**

**٤٦** - تابعی بەڕێز عطاء دەڵێت : هەموو شتێك لە قوماركردن ئەوا لە الميسرە، تەنانەت یاری كردنی منداڵان بە زار و گوێز .

**٤٧** - هەردوو تابعی بەڕێز عطاء و مجاهد دەڵێن : هەموو شتێك لە قوماركردن ئەوا لە الميسرە، تەنانەت یاری كردنی منداڵان بە زار و گوێز .

**٤٨** - بۆی گێڕاینەوە حمادی كوڕی یەحیای الضبعی، ووتی : محمدی كوڕی سیرین م بینی وە ئەو كۆمەڵە منداڵێكی بینی یاری دەكەن بە زار، جا ووتی : منداڵەكان، قومار مەكەن، چونكە بێگومان قومار لە المیسرە .

---

**: یاری كردنی منداڵان بە گوێز، هاوێشتن ولێدانیانە لە گوێزو هێلكە لەناو چاڵێكی بچووك كەلایانێ ئەمڕۆیە، جا هەڵماتێن و مەرمەڕێنیشی پێدەوترێ، والله اعلم .**

## محمدی كوڕی حسێن دەڵێت :

**٤٩** - ئاگاداركردنەوە و فێركردنی منداڵان كەوا ئەو یاریانە حەڕامە، وە ئەوە لە المیسرە، وە قوماریشە هەتاوەكو ئەگەر منداڵان گەورەبوون، دەزانن كەوا گەورە و مامۆستاكانیان ئینكاری و ڕێگریان لێكردوون، وە بێگومان پێیان ڕاگەیاندوون كە ئەوە حەڕامە، تاوەكو وازدەهێنن و لێی دووردەكەونەوە، ئەگەر نا منداڵان دەڵێن : بەڕاستی یاریمان پێكرد، هیچ كەس ئینكاری و ڕێگری لێ نەكردین، وە ئەگەر مونكەر و خراپە بووایە ئەوا ڕێگریان لێدەكردین .

پێویستە پیاو بەو شێوەیە بێت ئەگەر بینی منداڵێك كارێكی خراپ دەكات یان قسە دەكات بە شێوەیەك كە درووست نییە بۆی - لە جنێو و

قسەی ناشرین و زەمکردن و ..... هتد - ، فێری بکات کە ئەوە حەڕامە و دروست نییە بۆی ئەو کارە بکات یان ئەو قسەیە بڵێت .

: بنچینە لەوەدا فەرمایشتی الله تعالى کە دەفەرموێت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا﴾ (التَّحْريم : ٦) .

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و ژن و ماڵ و کەس و کارەکەتان بپارێزن لە ئاگر.

وە بە هەمان شێوە لە فەرموودەیەکی متفق علیه لە أبو هریرەوە رضي الله عنه دەفەرمووێ : ئێمە لەلای رسول الله بووین ﷺ کە ئەو خورمای خێر و صەدەقەی دابەشدەکرد، وە حەسەنی کوڕی علي لە کۆشیدا بوو، کاتێ لێبووەوە لە دابەشکردنی صەدەقەکە، پێغەمبەر ﷺ حەسەنی خستە سەر شانی، لیکی دەمی حەسەن ڕژ ایە سەرپێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ سەری بەرز کردەوە، بینی خورمایەك لەناودەمی حەسەنە، جا رسول الله ﷺ کوڵمی حەسەنی جوڵاند وفەرمووی : (فڕێی بدە ئەی کوڕەکەم، کخ کخ فڕێی بدە)، جا پێغەمبەرﷺ دەستی خستە ناودەمی وخورماکەی هێنایە دەرەوە، پاشان فەرمووی : (ئایا نازانی کە صەدەقە وخێرحەڵاڵ نییە بۆئالی محمد).

٥٠ - لە عبداللهی کوڕی عباس ەوە رضي الله عنهما، دەفەرمووێت : الميسر قومارە، پیاو هەبوو لە سەردەمی نەفامی ماڵ و منداڵی خۆی دەخستە مەترسییەوە و لە ڕەهن دایدەنا، جا هەریەکێکیان قوماری بکردایە لەگەڵ هاوەڵەکەی بە ماڵ و منداڵی دەڕۆیشت .

**٥١ -** له سعيدى كوڕى جبير ـەوە ڕەحمەحى اللهى ليبێت، دەڵێت : الميسر واتا : قومار بە هەموو جۆريەوە، وە جۆرێك لە قومار هەبوو لەسەردەمى نەفامى كاتێك پياوێك دەيووت : كوان هاوەڵانى (جزور) - ووشترێك يان هەر ئاژەڵێكە كە گونجاوە بۆ سەربڕين والله اعلم - ؟ جا كۆمەڵێك كەس هەڵدەستان و ئاژەڵێكيان دەكڕى، ئاژەڵەكەيان سەردەبڕى و بۆ هەر يەكێكيان بەشێكيان دادەنا، دواتر قورعەيان دەكرد جا ئەوەى ناوى دەرچووبا لە قورعەكە بەرى دەبوو لە نرخى ئاژەڵەكە - واتە پارەى نەدەدا - ، هەتا دواكەسيان دەمايەوە و نرخى ئاژەڵەكە دەكەوتە سەرى، وە هيچ بەشێكيشى نەدەبوو لە گۆشتەكە، الله عزَّوَجَل دەفەرموێ : ﴿قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ﴾ (البَقَرَة : ٢١٩) .

واتە : پێيان بڵێ : تاوان و گوناهيان گەورەيە .

**٥٢ -** شيبان بۆى گێڕاينەوە، لە قەتادەوە، لەبارەى ووتەى الله عزَّوَجَل دەڵێت : ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ﴾ (المائده: ٩٠) ئايەتەكە، فەرمووى : ئەمما (الميسر) : ئەوە قومارە، وە باسكراوە بۆمان كەوا پێغەمبەر ﷺ ڕێگرى كردووە لە دوو چوارگۆشەكە - زار - ، وە فەرموويەتى : (هي ميسر العجم)،

واتە : ئەو زارە قومارى عەجەمە .

قەتادە دەڵێت : وە پياو لە سەردەمى جاهيلى و نەفامى قومارى دەكرد بە ماڵ و منداڵى، جا خەم و پەژارەوە دادەنيشت سەيرى ماڵەكەى دەكرد لە

دەستی کەسێکی تر، وە بەوشێوە دوژمنایەتی و ڕق و کینە دەچێندرا لە نێوانیان، جا الله تعالی ڕێگری کرد لەو کارە، وە الله ئاگاداری پێیانی داوە دەربارەی خراپی قومار، وە الله تعالی زانایە بەوەی کەوا چ شتێك باشە بۆ دروستکراوەکانی .

**٥٣** - تابعی بەڕێز ئیمامی مجاهد لە تەفسیری ووتەی الله تعالی : ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ﴾ (البَقَرَة : ٢١٩)

واتە : لە بابەتی شەراب و قومارەوە لێت دەپرسن : ئاخۆ ئەوانە حەڵاڵ و ڕەوان، یان حەرام و ناڕەوان؟ پێیان بڵێ : تاوان و گوناهیان گەورەیە .

دەڵێت : (الميسر) : قومارە، وە بەڕاستی ناونراوە (الميسر) لەبەر ئەو ووتەیان : ئاژەڵێك بدەن لە زەوی - سەری بڕن - ، وەکو ووتەی : ئەوە و ئەوە دابنێ .

## محمدی کوڕی حسێن دەڵێت :

**٥٤** - جا ئەگەر کەسێك بەڵگەی هێنایەوە بۆ یاری کردن بە شەترەنج و ووتی : بەڕاستی کۆمەڵێك یاریان پێ کردووە لەوانەی کەوا ئاماژەیان بۆ دەکرێ بە عیلم و زانست .

پێی دەوترێ : ئەوە ووتەی کەسێکە کە شوێن هەوا و ئارەزووی خۆی دەکەوێت و واز دەهێنێت لە عیلم، بۆی نییە ئەگەر یەکێك لەوانەی کەوا

ئاماژەیان بۆ دەكرێ بە علیم هەڵەیەكیان كرد و تووشی پێ هەڵخلیسكان بوون ئەوا شوێن پێ هەڵخلیسكانەكەی بكەوێت، بێگومان ڕێگریمان لێكراوە - واتە نابێ شوێن هەڵەی زانایان بكەوین - ، وە بەڕاستی ترسێنراوین لە پێ هەڵخلیسكانی زانایان .

ئایا ووتەی پێغەمبەرمان ﷺ باسنەكرد لەسەرەتادا كە دەفەرمووێ : (كل شيء يلهو به ابن آدم فباطل إلَّا ثلاثاً ...)، جا شەترەنج لە یاری و گەمەی باتڵە .

ئایا ڕیوایەتمان نەكرد لە علي كوڕی ابي طالب ـەوە رضي الله عنه كەوا دەفەرمووێ : ئەو كەسەی سەیری یاری شەترەنج دەكات وەكو ئەوە وایە سەیری گۆشتی بەرازی كردبێت، وە ئەوەی هەڵیدەگێڕێتەوە وەكو ئەوە وایە گۆشتی بەرازی هەڵگێڕابێتەوە .

ئایا پرسیار نەكرا لە عبداللهی كوڕی عمر رضي الله عنهما لە بارەی شەترەنج، جا فەرمووی : ئەوە خراپترە لە تاوڵە .

وە ئایا پرسیار نەكرا لە قاسمی كوڕی محمد ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت لە بارەی شەترەنج، جا ووتی : هەر شتێك ڕێگری بكات لە زیكری الله تعالی و لە نوێژ ئەوە میسرە؟

كام لەو دوو وتەیە باشترە دەستی پێوە بگری، بەوەی كەوا رسول الله ﷺ و هاوەڵەكانی ڕێگریان لێكردووە، یان بەوەی كە یاری پێ كردووە، وە

شوێن هەوا و ئارەزووی کەوتووە، جا پێی هەڵخلیسکاوە لە ڕێی حەق، وە لەوانەیە تەئویلێکی کردبێ هەڵەی کردبێ تێیدا، جا دروست نییە و نابێت هیچ کەس شوێنی بکەوێت لە هەڵە و پێ هەڵخلیسکانەکەی .

: لە کتابی **(المنتقى شرح الموطأ)** باجي دەڵێت : ئەوەی ڕیوایەتکراوە لە عبداللهی کوڕی مغفل رضي الله عنه والشعبي وعکرمه، کەوا یاریان دەکرد بە تاوڵە، وە ئیمامی الشعبي یاری شەترەنجی دەکرد، جێگیر نەبووە، وە ئەگەر جێگیریش بێت ئەوا نەیانزانیوە کە ڕێگری لێکراوە و بێ ئاگا بوونە و هەڵەیان کردووە تێیدا **- واتا حوکمی ڕێگریکردنەکەیان پێ نەگەیشتووە ونەیانزانیوە کە حەرامە والله أعلم -** .

وە ڕیوایەت کراوە لە سعیدی کوڕی المسیب وابن شهاب کەوا مۆڵەتیانداوە یاری بکرێ بە تاوڵە، وە ئەو ڕیوایەتانە هەمووی جێگیر نەبووە وەکو پێشتر باسمان کرد، وە بەڕاستی ئەوە هەوالانێکن ئەهلی هەواو ئارەزوو دەستی پێوە دەگرن وەکو پێداگریەك لەسەرئەوەی کەوا لەسەرینە لە باتڵ وخراپە، والله المستعان .

- **ابن القيم** لە **(الفروسيه - ص ٢٤٨)** دەڵێت : وە نەزانراوە یەکێک لە هاوەڵان حەڵاڵی کردبێ وبەدروستی زانیبێ، وە نە یاری پێ کردبێ، بێگومان الله تعالى پەنایدابوون و ئەوانی دوورخستبووەوە لەو یارییە، وە هەموو ئەوەی پاڵ دەدرێ بۆلای یەکێك لەوان گوایە ئەو یارییەی کردووە وەکو أبي هريره رضي الله عنه ئەوە درۆ و بوختانە بەسەر هاوەڵانەوە رضي الله عنهم، نکۆڵی لێدەکات هەرکەسێ زانابێ بە ژیانی هاوەڵان، وە هەرکەسێ شارەزا بێ لە ئاثار.

وە چۆن ڕێگەدەدن باشترینی سەردەم وباشترین دروستکراو دوای رسول الله ﷺ یاری کردن بە شتێك ڕێگە گرتنی لە زیکر ویادی الله تعالى وە لە نوێژ گەورەتر و زیاترە لە ڕێگری

كردنی عارەق ئەگەر ڕۆچووبێت تێیدا یاریکەرەکە و ئاڵوودەبووبێت پێی، وە و اقع شایەتی ئەوەیە .

- لە (السنن الكبرى - ١٠ / ٣٥٦) ئیمام ئەوزاعی رحمە اللە دەفەرموێت : ئەوەی دەست بگرێت بە ووتەی شازودەگمەنی زانایان ئەوا دەردەچێ لە ئیسلام .

- وە لە (جامع بيان العلم - ١٧٦٧) سلیمان التيمي پێی ووتم : ئەگەر دەست بگری بە مۆڵەتی هەموو زانایەك ئەوا هەموو خراپەیەكت تێدا كۆبووەتەوە .

ابن عبدالبر دەڵێت : ئەوە اجماعێکە نەمزانیوە جیاوازی هەبێت تێیدا، والحمدلله .

- وە لە (السنن الكبرى - ١٠ / ٣٥٦) لە أبي العباسی کوڕی سریج دەڵێت : بیستم ئیسماعیلی کوڕی ئیسحاقی قازی دەیووت : چوومە ژوورەوە بۆلای المعتضد، جا کتابێکی پێدام تەمەشای ناویم کرد، بۆی کۆکرابووەوە مۆڵەت لە پێهەڵخلیسکان و هەڵەی زانایان، وە ئەوەی دەستی پێوە گرتبوو بۆ خۆی هەریەك لەوان، جا پێم ووت : ئەی پێشەوای ئیمانداران، دانەری ئەو کتابە زندیقە !

خەلیفەش ووتی : ئایا ئەو فەرموودانە صەحیح نین ؟!

ووتم : فەرموودەکان لەسەرئەوەن کە ڕیوایەتکراون - و اتە بەپێی بەهێزی و لاوازی سەنەدەکەیانن والله اعلم - ، بەڵام ئەوەی ڕێگەی داوە بە سەرخۆشکەر ڕێگەی نەداوە بە موتعە، وە ئەوەی ڕێگەی داوە بە موتعە ڕێگەی نەداوە بە گۆر انی و سەرخۆشکەر، وە هیچ زانایەك نییە ئیللا پێهەڵخلسکانێك و هەڵەیەکی هەیە، وە ئەوەی هەڵەی زانایان کۆبکاتەوە و پاشان دەستی پێوە بگرێ ئەوا دینەکەی ڕۆیشتووە، جا المعتضد فەرمانی کرد و کتابەکەیان سووتاند .

**٥٥** - له زیادی كوڕی حدیر، دهڵێت : بیستم عومهری كوڕی خطاب دهیووت : سێ شت گومڕاكهرن : پێشهوایهكی گومڕاكهر، وه گفتوگۆی دووڕوویهك به قورئان، وه پێ ههڵخلیسكانی زانایهك .

**٥٦** - بۆی گێڕاینهوه عقبهی كوڕی صالح الأَوْدِيّ، دهڵێت : پیاوێك به ئیبراهیمی ووت وه من لهلای دانیشتبووم، جا ووتی : ئهوه عقبه لهلات دادهنیشێت له كاتێكدا ئهو سهری خستووهته سهر شهترهنجهكهی له تهواوی ڕۆژهكهیدا؟

عقبه دهڵێت : ئیمامی ئیبراهیم ئاوڕی دایهوه بهلامدا و ووتی : داوای شتێكت لێدهكهم پێم دهدهیت ؟

ووتم بهڵێ، بهسهر چاو .

ووتی : ئهو نهفرهت لێكراوه .

ووتم : چ شتێك؟

ووتی : شهترهنجهكه، ساڵێك پێمی بده یاری پێمهكه .

ووتم : ئهی باوكی عمران، سوێند به الله تعالی ههتا دهبردرێمه لای الله تعالی یاری پێناكهم .

: ئیمامی دارمی لە مسندەكەی بە ژمارە (٢٢٠) ڕیوایەتی كردووە لە زیادی كوڕی حدیر، وتی : عمر كوڕی خطاب رضي الله عنه پێی ووتم : دەزانی چی ئیسلام لەناو دەبات؟

ووتم : نەخێر.

ووتی : لەناوی دەبات هەڵە و پێهەڵخلیسكانی زانا، وە گفتوگۆی منافق بە قورئان، وە حوكمی پێشەوایانی گومڕاكەر.

- وە ڕیوایەت كراوە لە معاذي كوڕی جبل رضي الله عنه : بەڕاستی ئەوەی زۆر دەترسێم بەسەرتان دابێت سێ شتە : گفتوگۆی منافق بە قورئان، وە هەڵەو پێهەڵخلیسكانی زانا، وە دونیا گەردنتان ببڕێ - واتە شەڕبكەن لەگەڵ یەكتری لەسەر دونیا واللە أعلم - .

- لە (جعدیات - ١٣١٩) سلیمان التیمي ووتی : ئەگەر دەست بگری بە مۆڵەتی هەموو زانایەك یان پێهەڵخلیسكانی هەموو زانایەك ئەوا هەموو خراپەیەكت تێدا كۆبووەتەوە .

- وە لە (مسائل) ی عبداللەی كوڕی ئیمام احمد رحمهما الله (١٦٣٢) ئیمام یەحیای كوڕی سعید القطان رحمه الله دەڵێت : ئەگەر كەسێك كاری كرد بە هەموو مۆڵەتێك بە ووتەی ئەهلی كوفە لەبارەی النبیذ، وە ئەهلی مەدینە لەبارەی گوێگرتن .

واتە : گۆرانی، وە ئەهلی مەككە لەبارەی المتعه، ئەوا پێی فاسق دەبێت .

وە لە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) ی ئیمام الخلال (١٧٠) لە ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم دەڵێت : هەركەسێك ووتەی شازی زانایان هەڵبگرێت -كاری پێبكات- ئەوا خراپەیەكی زۆروگەورەی هەڵگرتووە .

- وه له (الفقيه والمتفقه - ٢ /٢٧) عبداللەی کوڕی المعتز دەڵێت : هەڵە و پێهەڵخلیسکانی زانا وەکو شکانی کەشتی وایە، خۆی نقوم دەبێت و لەگەڵیشیدا خەڵکێکی زۆرنقوم دەبێت .

- وه له (ذم الملاهي - ٩٥) هاتووه له عقبەی کوڕی صالح، دەڵێت ، ووتم به ئیبراهیم : چی دەڵێی دەربارەی یاری کردن به شەترەنج چوونکه زۆرحەزم لێیه یاری پێبکەم؟

ووتی : ئەوه نەعلەت لێکراوه، یاری پێمەکه .

ووتم : بەڕاستی ناتوانم ئارامبگرم لەسەری .

ووتی : جا سوێند بخۆ ساڵێك یاری پێ نەکەیت .

ووتی : سوێندم خوارد، ئارامگرت لەسەری .

## باب - ٦

## ڕێگریکردن لە یاریکردن بە ئاژەڵان



**٥٧** - یزیدی كوڕی خالد، لە سعیدی كوڕی جبیر ـەوە، دەڵێت : چوومە دەرەوە لەگەڵ عبداللّەی كوڕی عمر رضي الله عنهما هەتاوەكو گەیشتینە بەقیع، بینیمان كۆمەڵە گەنجێك لە قوڕەیش مریشكێك بە نیشانە دەگرن - بۆ ئەوەی تیر و ڕمی تێبگرن - ، جا كاتێك ئێمەیان بینی هەڵاتن .

عبداللّەی كوڕی عمر فەرمووی : پێم خۆش نییە ئەو كارە بكەم و هەرچی هەیە لە دونیا و ئەوەی تێیدایە هی من بێت، تەمەنیشم تەمەنی نوح بێت لەناو قەومەكەی .

سعید دەڵێت : پێم ووت : ئەی باوكی عبدالرحمان؟!

ئیمامی عبداللّەی كوڕی عمر رضي الله عنهما فەرمووی : رسول الله ﷺ نەعلەتی كردووە لەو كەسەی ئاژەڵ بە ئامانج و نیشانە دەگرێت .

**٥٨** - لە عبداللەی کوڕی عباس ـەوە رضي الله عنهما دەفەرمووێت : پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردووە، یان دەفەرمووێت : هەر شتێک گیانلەبەر بێت بە هەدەف و ئامانج ناگیرێت .

---

**: رواه احمد (٢٤٨٠) ، ورواه مسلم (١٩٥٦)**

**٥٩** - لە عبداللەی کوڕی عباس ـەوە رضي الله عنهما دەفەرمووێت : پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردووە لەوەی هەر شتێك گیانلەبەر بێت بە هەدەف و ئامانج بگیرێت .

---

**: رواه احمد (٢٧٠٥) ، والترمذي (١٤٧٥)**

**٦٠** - الشريد دەڵێت، بیستم رسول الله ﷺ فەرمووی : هەرکەسێك چۆلەکە بکوژێت بێ ئەوەی پێویستی پێبێت ئەوا لە ڕۆژی دوایی ئەو چۆلەکەیە دەنگ بەرز دەکاتەوە و شکایەت دەکات لەلای الله تعالى و دەڵێت : ئەی پەروەردگارم، بەڕاستی ئەو کەسە هەروا و بێ پێویستی منی کوشت، وە منی نەکوشت بۆ سوود و قازانجێك.

**٦١** - الشريد دەڵێت، بيستم رسول الله ﷺ فەرمووی : هەرکەسێك چۆلەکە بکوژێت بێ ئەوەی پێویستی پێبێت ئەوا ئەو چۆلەکەیە دەنگ بەرز دەکاتەوە لەلای الله تعالى و دەڵێت : ئەی پەروەردگارم، بەڕاستی ئەو کەسە هەروا و بێ پێویستی منی کوشت، وە منی نەکوشت بۆ سوود و قازانجێك .

## باب - ٧

## ڕێگریکردن لە یاری کردن بە کۆتر



**٦٢** - لە أبو هريرەوە رضي الله عنه : کەوا پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی بەدوای کۆتر دەکەوێت، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : شەیتانێك بە دوای شەیتانێك دەکەوێت .

---

**: رواه احمد (٨٥٤٣)، وأبو داود (٤٩٤٠)، وابن ماجه (٣٧٦٥) .**

**٦٣** - لە أبي سلمە کوڕی عبدالرحمان : کەوا پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی چاوی بەدوای کۆتر دەگێڕێت، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : شەیتانێك بە دوای شەیتانێك دەکەوێت .

---

**: رواه عبدالرزاق (١٩٧٣٣) .**

**٦٤** - له ئەنەسی کوڕی مالك ـەوە رضي الله عنه، دەفەرمووێت : رسول الله ﷺ فەرمووی : کاتێك پیاوێکی بینی بەدوای باڵندەیەك دەکەوێت لە سەربانێك جا فەرمووی : شەیتانێکە بەدوای شەیتانێك دەکەوێت .

**: رواه ابن ماجه (٣٧٦٧) .**

**: ابن القیم لە (الطُّرق الحكمية : ٢ / ٧٢٦) دەڵێت : ئەوشتانەی کە پێویستە لەسەر دەسەلاتداربیکات : وە پێویستە لەسەرسوڵتان کەوا ڕێگری بکات لەوکەسانەی یاری دەکەن بە کۆتر بەبەرچاوی خەڵکیەوە، چونکە ئەوان بەو کارەیان دەبنە چاودێر بەسەر خەڵکییەوە و چاو دەبڕنە عەورەت و ناموسی خەڵکی - دەچنە سەربانەکان - ، ئیمامی أبو داود هێناویەتی لە سونەنەکەی لە فەرموودەی أبو هریره رضي الله عنه، کەوا پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی بەدوای کۆتر دەکەوێت، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : شەیتانێك بە دوای شەیتانێك دەکەوێت .**

**وە تابعی بەڕێز ئیبراهیم النخعي دەڵێت : هەرکەسێك یاری بکات بە کۆتری فڕیو نامرێت هەتاوەکو ئازاری هەژاری و فەقیری نەچێژێت .**

**وە ئیمام حەسەنی بصري ش دەفەرمووێت : عثمانی کوڕی عفان م بینی رضي الله عنه کاتێ ووتاری دەدا، فەرمانی دەکرد بە سەر بڕینی کۆتر، وە کوشتنی سەگەکان .**

**بوخاری باسی کردووە .**

**وە خالید الحذاء لە هەندێك تابعینەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت : قەومی فیرعەون یاریان دەکرد بە کۆتر.**

وه شريحى قازى شايهتى وهرنهدهگرت لهوكهسهى كۆترڕادهگرێت وبه دروستى دانهدهنا .

وه عبداللهى كوڕى مبارك دهگێڕێتهوه له ئيمام سوفيان الثوري، دهڵێت : بيستوومانه كهوا ياريكردن به الجلاهق [بوندوق]، وه يارى كردن به كۆتر له كارو كردهوهى قهومى لوطه .

وه ئوسامهى كوڕى زيد رضي الله عنه دهفهرموێت : بينيم ئيمامى عمررضي الله عنه فهرمانى دهكرد بهسهربڕينى كۆترى فڕيو، وه وازبهێنرێت له كۆتره باڵ بڕاوهكان .

## محمدى كوڕى حسين دهڵێت :

٦٥ - ههموو ئهوهى هێنامان بۆ ڕێگريكردنه لێى، چونكه بهڕاستى باتڵه، وه حهڵاڵ نييه ياريكردن پێى، زۆرێك له خهڵكى لهشاره جياوازهكان يارى پێدهكهن، پاشان نادۆزيهوه كهسێك ئينكارى ئهو كارهيان لێبكات، ئهوهش لهبهر ئهوهيه :

لهوان : ئهوانهى ئاماژهيان بۆ دهكرێ له خهڵكى گهوره و به شهرهف .

وه لهوانهش : ئهوانهن كه ئاماژهيان بۆ دهكرێ به خۆشهويست و نزيكهكانى سوڵتان و پاشا .

وە لەوانەش : سوودێکی بۆی هەیە بە کرێی دەدات بۆ ئەو کەسەی قومار دەکات تێیدا، وە ئەو کەسەی یاری بە باتڵ دەکات جا هیچ کەسێکیش نییە ئینکاری ئەو کارەیان لێبکات .

وە لەوانە : تاوانبارکردن و سەرزەنشتکردنی ئەوانەی کە توانای بەرگریان لەخۆیان نییە .

کە ئەم ڕەفتارە خراپەش ئاشکرا و خراپتر دەبێت بۆ ئەمانە :

جا هەندێکیان یاری تاوڵە و شەترەنج دەکەن .

وە هەندێکیان یاری بە کۆتر و بلبل و قوماری پێدەکات .

وە هەندێکیان ماڵی قوماری هەیە قوماری تێدا دەکات بە درهەم و جل و بەرگ هەتا پیاوێکیان لەوان دەمێنێتەوە کە قوماری بە ماڵ و جل وبەرگی کردووە .

وە هەندێکیان یاری دەکات بە شەڕە بەران شەڕە کەڵەشێر، وە جگە لەوانە لە باڵندەکان .

وە هەموو ئەوانە گوناح و سەرپێچی سەردەمی نەفامین، الله تعالى ڕێگری لێکردووە، وە رسول الله ﷺ ڕێگری لێکردووە، وە زانایان ڕێگریان لێکردووە، وە زانایان ڕێگریان کردووە لە هاوەڵێتی و برادەرێتی ئەو جۆرە کەسانە و سەلام لێکردنیان، والله المستعان .

چەند گەورەیە ئەوەی خەڵکی تێیدایە لە تاقیکردنەوە لە چەندین ئاڕاستەی زۆر و ناشیرنی دیار و پەنهان لە تایبەت و گشتی کە باسکردنی درێژە دەکێشێت .

وه چەند زۆرن ئەوانەی باتڵ بەهێز دەکەن و کردوویانەتە کاسبی بۆ خۆیان، گوێ نادات بەوەی زۆرێك لە خەڵکی لە دینەکەیان ڕۆیشتووە گەر دونیایان سەلامەت بێ - واتە گوێی پێنادەن دینیان ڕۆشتبێ بەڵکو ئەوەی گرینگ لایان ئەوەیە کە دونیایان بۆ فەراهەم کرابێ لەهەموو ڕوویەکەوە - ئەوە نیشانەی کەسێك نییە کە چاکەی بۆ ویسترابێت .

---

: ئیمامی أبو داود بابێکی داناوە لە سونەنەکەی لەبارەی (بەشەڕهێنانی ئاژەڵان) .

وە بە هەمان شێوە ئیمامی الترمذي رحمه الله بابێکی داناوە : (باب ما جاء في كراهيه التحريش بين البهائم . .) .

هەردووکیان بەسەنەدی خۆیان لە ڕێگەی أبي يحي القتات، عن مجاهد، عن ابن عباس رضي الله عنهما، دەفەرمووێت : رسول الله ﷺ ڕێگری کردووە لە هاندان بۆ شەڕلە نێوان ئاژەڵان - وەکو کەووکەڵەشێرو سەگ و بەران و . . . . هتد - .

وه ئیمامی بوخاری رحمه الله لە **(الأدب المفرد - بابی بە شەڕ هێنانی ئاژەڵان)**، دەڵێت : لە ڕێگەی لیث، لە مجاهدەوە، لە عبداللەی کوڕی عمرەوە رضي الله عنهما کەوا پێی ناخۆش بووە بەشەڕهێنانی ئاژەڵان .

## باب - ٧

باسی حەرامیەتی گوێگرتن لە گۆرانی و ئامێرە مۆسیقیەکانی وەکو : هەموو جۆرە ئامێرێکی مۆسیقی، شمشاڵ، الصنج - زیلی مسین - و دەف و تەپڵ و عود و الطنبور - جۆرە ئامێرێکی مۆسیقییە - وە هاوشێوەی ئەوانە



### محمدی کوڕی حسین دەڵێت :

٦٦ - هەموو ئەوانە حەرامە بەکارهێنانیان پێغەمبەر ﷺ نێردراوە بە سڕینەوە و نەهێشتنی ئەو ئامێرانە، لەبەرئەوەی لە کار و کردەوەی جاهیلی و نەفامییە، بۆیە الله تعالى هەمووی حەرام کردووە، وە ئەو ئامێرانە و زیاتریش زۆر بووە و پەرەی سەندووە لەناو خەڵکی، بووەتە کاسبی فاسق و خراپەکاران، وە کەسانێك دەبیننەوە کە یارمەتییان دەدەن لەسەر ئەو کارە .

٦٧ - لە علي کوڕی أبو طالبەوە رضي الله عنه ، دەفەرمووێت : رسول الله ﷺ فەرمووی : نێردراوم بە شکاندنی ئامێرە مۆسیقییەکان .

وه سوێند دهخۆم به پهروهردگارم تعالى : هیچ بهندهیهك نییه عارهقێك بخواتهوه له دونیا ئیللا الله تعالى له ڕۆژی قیامهتدا ئاوێکی بهکوڵ و زۆر گهرمی دهرخوارد دهدات، سزای دهدات یان لێی خۆش دهبێت .

پاشان رسول الله ﷺ فهرمووی : ئیش و کاسبی گۆرانیبێژی پیاو و ئافرهت حهڕامه .

وه کاسبی ئافرهتی زیناکار حهڕامه .

وه مافه لهسهر الله تعالى کهوا گۆشتێك نهخاته بهههشتهوه که به حهڕام گهشهی کردووه و دروست بووه .

---

: **ئیمامی مسلم** **ڕیوایهتی کردووه به ژماره (٢٠٠٢) له جابرهوه رضي الله عنه، کهوا پیاوێك له جیشانهوه - شوێنێکه له یهمهن - ، هاته لای رسول الله ﷺ، جا پرسیاری کرد له رسول الله ﷺ لهبارهی خواردنهوهیهك که دهیخۆنهوه له ناوچهکهیان که له گهنمهشامی دروست دهکرێت، پێی دهوترێ : المزر، جا پێغهمبهر ﷺ فهرمووی : ئایا ئهو خواردنهوهیه سهرخۆشکهره ؟**

**پیاوهکه ووتی : بهڵێ .**

**رسول الله ﷺ فهرمووی : ههموو سهرخۆشکهرێك حهڕامه، الله تعالى پهیمانی داوه که ههرکهسێک سهرخۆشکهر بخواتهوه، ئهوا له قوڕی الخبالى پێ دهدات تا بیخواتهوه .**

**هاوهڵان ووتیان : ئهی رسول الله ﷺ، قوڕی الخبال چییه؟**

**فەرمووی : ئارەقەی ئەهلی دۆزەخ، یان شەربەتی ئەهلی دۆزەخ .**

٦٨ - لە أبي ئومامەوە رضي الله عنه، دەفەرموویت : رسول الله ﷺ فەرمووی : نێردراوم بە ڕەحمەت و ڕێنموونی بۆ جیهانیان، بۆ سڕینەوە و نەهێشتنی بت پەرستی و ئامێری مۆیسقی و والمزامیر - گۆرانی - و کار و کردەوەی جاهیلی .

٦٩ - لە أبي ئومامەوە رضي الله عنه، دەفەرموویت : رسول الله ﷺ فەرمووی : بێگومان الله تعالی منی ناردووە بە ڕەحمەت و ڕێنموونی بۆ جیهانیان، وە فەرمانی پێکردووم کەوا ئامێری مۆسیقا و عارەق و سەرخۆشکەر بسڕمەوە و نەهێڵم، وە ئەو بتانەی کە دەپەرستران لە جاهیلی .

وە باسی فەرموودەکەی کرد .

٧٠ - لە عطائی کوڕی یسار، دەڵێت : بۆی گێڕامەوە عبداللهی کوڕی عمری کوڕی عاص رضي الله عنهما، دەفەرموویت : بەڕاستی ئەو ئایەتەی کە لە قورئاندا هاتووە : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ **(المَائدة : ٩٠)** .

لە تەوڕاتدا بەو شێوەیە : بێگومان الله تعالی حەق و ڕاستی دابەزاندووە بۆ ئەوەی باتڵی پێ لەناوببات وە بەتاڵی بکاتەوە بەهۆیەوە یاری و ئامێرە

مۆسیقییەکان و الزاهر و شایی و سەما و الزمارات - ئالەتێکی موسیقیە کە لەدار دروست دەکرێ - و الطنبور و شیعر و عارەق ئەگەر بۆ جارێکیش بێت ئەو کەی تامی کردبێت، وە پەروەردگارم تبارك وتعالی سوێندی خواردووە بە سوێندی خۆی وە توندی و بەهێزی هەرکەسێك عارەق بخواتەوە دوای ئەوەی کە حەڕامم کردووە لەسەری ئیللا تووشی تینوویەتی دەکەم لە ڕۆژی قیامەت، وە هەر بەندەیەکم وازی لێهێنێت دوای ئەوەی حەڕامم کرد لەسەری ئیللا خواردنەوەی پێدەدەم لە حظيرة القدس - مەبەست پێی بەهەشتە والله اعلم - .

**٧١** - لە مطری کوڕی سامەوە ، دەڵێت : ئیمامی علی کوڕی أبو طالب دەفەرمووێت : رسول الله ﷺ ڕێگری کردووە لە لێدانی دەف و تەپڵ و دەنگی شمشاڵ .

**٧٢** - لە عبدالرحمن ی کوڕی عەوف رضي الله عنهما ، دەفەرمووێت : رسول الله ﷺ دەستی گرتم و بردمی بۆلای دار خورمایەك، لەوێدا ئیبراهیمی کوڕی لەسەرە مەرگدا بوو، عبدالرحمن دەفەرمووێ : پێغەمبەر ﷺ ئیبراهیمی وەرگرت و لەباوەشی خۆی داینا، چاوەکانی فرمێسکی لێدەهاتنە خوار، پاشان فەرمووی : ئەی ڕۆڵەکەم، هیچ شتێکم لەدەست نایەت بۆت بکەم لای الله تعالی . پاشان گریا .

جا ووتم : ئەی رسول الله، ئەوە دەگرییت! ئایا ڕێگریت نەکردووە لە گریان لەسەر مردوو؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (بێگومان ڕێگریم کردووە لە النوح - هاوار و قیژە لەسەر مردوو - ، لە دوو دەنگی گەمژەی تاوانبار : دەنگێك لە کاتی نیعمەت و خۆشی، یاری و گاڵتە و گەپی گۆرانی و مۆسیقای شەیتان .

وە دەنگێك لە کاتی بەڵا و ناخۆشی، ڕوومەت ڕنین و یەخە دڕاندن و هاوار و قیژەی شەیتان .

وە ئەوە - گریانێکی هێواش و لەسەرخۆ والله اعلم -، ڕەحمەت و میهرەبانییە، وە هەرکەسێك ڕەحم نەکات بەکەسی بەرامبەر ئەوا الله تعالى ش ڕەحمی پێناکات .

ئەی ئیبراهیم، ئەگەر فرمانێکی حەق نەبوایە، وە بەڵێنێکی ڕاست نەبوایە، وە ئەوە ڕێگەیەکە پێویستە پێیدا بڕۆین هەتا کۆتا کەسمان دەگاتەوە بە سەرەتامان، غەمبار دەبووین بۆت بە غەمبارییەك زیاتر و توندتر لەوە، وە بێگومان ئێمە بۆتۆ زۆر غەمبارین، چاو دەگریێت، وە دڵ غەمبار دەبێت، وە شتێك ناڵێین کە الله تعالى تووڕە بکات)

---

: (رواه الترمذي : ١٠٠٥) .

له (ذم الملاهي : ٦٥ ) له حسن ەوه، دەڵێت : دوو دەنگ نەعلەتی لێکراوه : گۆر انی و مۆسیقا له کاتی خۆشی، وه هاوارو قیژه له کاتی بەڵا و موسیبەت .

- ابن القيم له (مسأله السماع : ص ٢٦) دەڵێت : مەبەست له دەنگی یەکەم : ئەوەی لەکاتی غەم و بەڵا و موسیبەت ڕوودەدات له هاوار و قیژه و واوەیلا کردن و هاوشێوەی ئەوانه .

وه مەبەست له دەنگی دووەمیش : ئەوەی له کاتی چێژو خۆشی ڕوودەدات له گۆر انی و ئەوەی بەدو ایدا دێت، چونکه بێگومان نەفس هێزی خۆشی و ئاسوودەیی و هێزی غەم و خەفەتیش هەیه، جا کاتێك کەسێك شتێکی بەسەرداهات له خۆشی یان ناخۆشی و ئەو دەنگەی هەڵبژارد تێیدا وه ئەوەی به دو ایدا دێت وه ئەو دەنگەو لێکەوتەکانی بەپێی بەهێزی و لاوازی نەفسی کەسەکەیه، جا لەو کاتەدا شەیتان هانیدەدات، وه مەبەستەکەی لێ بەدەست دەهێنێت به سەرپێچیکردنی الله تعالى و دەرچوون له فەرمانەکەی لەو حاڵەتەدا - له خۆشی - و لەو حاڵەتەدا - له ناخۆشی - .

وه لەبەرئەوەیه الله سبحانه به یاسا دایناوه بۆبەندەکانی لەکاتی ئەودوو حاڵەتەدا که دڵ و ئیمان و دینی بەنده دەپارێزێت لەوەی لێی بسێنێت و هانیبدات بۆ خر اپه، جا به یاسا دایناوه بۆیان له کاتی بەڵا و موسیبەت : ئارامگرتن و ووتنی إنا لله و انا اليه راجعون، وه لەکاتی نیعمەت و خۆشی : بردنی سوجدەی شوکر و نو اندنی تواضع و بێ فیزی بۆ الله تعالى، وه سوپاسکردنی و شوکر انەبژێری، بەوه نیعمەت و خۆشی بەردەوام دەبێت، وەکو چۆن به ئارامگرتن و گەڕانەوه بۆ لای الله تعالى بەڵا و موسیبەت له دڵ دەردەچێ یان زۆر سووك دەبێت لەسەر کەسەکه، بەڵام شەیتان و شوێنکەوتووەکانی دژایەتی فەرمانی الله تعالى یان کرد و لەکاتی خۆشی و ناخۆشی دوو دەنگی گەمژەی خر اپەیان داهێنا : دەنگی هاوار و قیژەو پاڕانەوه به واوەیلا و ئەوەی بەدوای ئەو انەدا دێت، وه دەنگی گۆر انی و ئامێره مۆسیقییەکان و ئەوەی به دوای ئەو انەوه دێت .

## باب - ٨

## پاكڕاگرتنی گوێیەكانی كەسە عاقڵەكان لە گوێگرتن لەو ئامێرە مۆسیقییانەی كە باسمانكرد



**٧٣** - لە نافعەوە، دەفەرمووێت : كەوا ڕۆژێكیان لەگەڵ عبد اللّٰەی كوڕی عمر رضي الله عنهما بووم بە ڕێگەدا دەڕۆیشتین، جا گوێی لەدەنگی شمشاڵی شوانێك بوو، جا ڕێگاكەی گۆڕی و پاشان بە نافعی ووت : ئایا دەنگی دەبیستی؟

نافع ووتی بەڵێ .

نافع دەڵێت : بەردەوام دەیووت ئەی نافع، دەنگی دەبیستی؟ ووتم : نەخێر، جا عبد اللّٰەی كوڕی عمر هەردوو پەنجەكانی دەرهێنا لە گوێكانی، پاشان گەڕایەوە سەر ڕێگاكە،

عبداللّٰەی كوڕی عمر رضي الله عنهما دەفەرمووێت : بینیم رسول الله ﷺ بەم شێوەیەی دەكرد .

**: رواه احمد (٤٥٣٥ ، ٤٩٦٥)، و ابو داود (٤٩٢٤) .**

**٧٤** - نافع بۆی گێڕاینەوە دەفەرمووێ : لە دوای عبد الله ی کوڕی عمر رضي الله عنهما بووم بە سواری حوشتر، کاتێ تێپەڕی بەلای شوانێکدا شمشاڵی لێدەدا، جا لە ڕوخساری حوشترەکەی داو ڕووی وەرگێڕا و دوو پەنجەی خستە ناو هەردوو گوێیەکانیەوە و دەیووت : ئایا دەنگی دەبیستی نافع؟ ئایا دەنگی دەبیستی؟ هەتاوەکو دەنگەکە پچڕا و نەما .

ووتم : نابیستم، جا عبد اللهی کوڕی عمر حوشترەکەی هێناوە سەر ڕێگاکە و ووتی : بینیم رسول الله ﷺ بەم شێوەیەی کرد کاتێ شتێکی لەم شێوەی بیست .

---

**: رواه ابو داود (٤٩٢٥) .**

**٧٥** - بۆی گێڕاینەوە محمدی کوڕی خالد، جا بەهەمان شێوە باسی فەرموودەکەی کرد .

**٧٦** - بۆی گێڕاینەوە مالکی کوڕی أنس، لە محمدی کوڕی المنکدر، دەڵێت : لە ڕۆژی قیامەتدا دەوترێ : لە کوێن ئەوانەی خۆیان و گوێیەکانیان پاکڕادەگرن لە گۆرانی و مۆسیقای شەیتان؟

بيانخەنە ناو باخی میسکەوە، پاشان دەووترێ بە فریشتەکان : وایان لێبکە گوێیان لە سوپاس و ستایشەکانم بێت و ببیستن - واتە ئەوانەی کە گوێیان دەپارێزن لە بیستنی حەڕام ئەوا وەك پاداشتێك بۆیان الله تعالی سوپاس و ستایشیان دەکات و ڕەزامەندی خۆی بۆیان دەردەبڕێ - ، وە هەواڵیان پێ بدە کەوا هیچ ترسێکیان لەسەر نییە و هیچ دڵتەنگ و غەمباریش نەبن .

**٧٧** - لە مالکی کوڕی أنس ەوە، لە محمدی کوڕی المنکدر، دەڵێت : الله تعالی بە فریشتەکان دەفەرمووێ لە ڕۆژی قیامەتدا : لە کوێن ئەوانەی خۆیان و گوێیەکانیان پاکڕادەگرن لە گۆرانی و مۆسیقای شەیتان؟ بیانخەنە ناو باخی میسکەوە، پاشان بە فریشتەکان دەفەرمووێ : وایان لێبکە گوێیان لە سوپاس و ستایشەکانم بێت و ببیستن، وە هەواڵیان پێ بدە کەوا هیچ ترسێکیان لەسەر نییە و هیچ دڵتەنگ و غەمباریش نەبن .

**٧٨** - لە منصورەوە، ئیمامی مجاهد دەڵێت : بانگکەرێك بانگ دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا : لە کوێن ئەوانەی خۆیان و گوێیەکانیان پاکڕادەگرن لە گۆرانی و مۆسیقای شەیتان؟

مجاهد دەڵێت : جا الله تعالی دەیانخاتە ناو باخێک لە میسك، پاشان بە فریشتەکان دەفەرمووێ : وایان لێبکە گوێیان لە سوپاس و ستایشەکانم بێت و ببیستن، وە هەواڵیان پێ بدە کەوا هیچ ترسێکیان لەسەر نییە و هیچ دڵتەنگ و غەمباریش نەبن .

## محمدی کوڕی حسێن دەڵێت :

**٧٩** - لە ناو خەڵكی كۆمەڵێك هەن نەفسی خۆیان پاك ڕادەگرن لە گوێگرتن لە گۆرانی و مۆسیقا كە كەمێك چێژ و خۆشی تێدایە، بۆیە كەسی عاقڵ لە ناو خەڵكی ناهێڵێت نەفسی شوێن هەوا و ئارەزووی بكەوێت بەڵكو ڕێگری لێدەكات لەو كارە .

بیستوویەتی الله تعالی دەفەرمووێ : ﴿**وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ (٤٠) فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَىٰ**﴾ (النـازِعات)

واتە : بەڵام ئەوكەسەی لە گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگاری خۆی ترسابێت و جڵەوی نەفسی لە هەواو ئارەزوو گرتبێتەوە، جا ئەوە بێگومان بەهەشتە جێی مانەوەو حەوانەوەی .

لەم ووتەی الله تعالی تێگەیشتووە بۆیە نەفسی خۆی پاراستووە لە حەزوو ئارەزووەكانی بە هیدایەت و یارمەتیدانی الله تعالی بۆی، ئا ئەوە عاقیبەت و كۆتایی ئەو كەسەیە كە لەسەرەوە باسمانكرد .

زانیویەتی كە گوێگرتن لەوەی كە نەفس حەزی لێیەتی لە گۆرانی و مۆسیقا و شتی بێ مانا و بێ سوود ڕێگەپێنەدراوە بۆیە پشتی لێ هەڵكرد و ڕووی لێوەرگێڕا .

بیستوویەتی الله تعالی لە مەدح و ستایشی عاقڵەکان دەفەرمووێ :

﴿وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُواْ عَنْهُ﴾ (القَصَص : ٥٥)

واتە : هەرکە قسەی بێسوود دەبیستن، ڕووی لێوەر دەگێڕن .

وە بیستوویەتی الله تعالی دەفەرمووێ :

﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ﴾ (المُؤمنون : ٣)

واتە : ئەوانەش کە لە بەرامبەر کار و کردار و ووتەی پڕوو پووچ و شتی بێ ماناو بێ سوود، ڕوو هەڵدەسووڕێنن و پشت هەڵدەکەن .

جا الله تعالی مەدح و ستایشی کردن بە پشت هەڵکردنیان لە قسە و کرداری باتڵ، جا الله تعالی دەیەوێت بەندەکەی گوێ لەو شتانە بگرێت کە لەو نزیکی دەکاتەوە بەهۆی گوێگرتنی لە شتی باش و چاك گەورەکەی [واتە الله تعالی] خۆشی دەوێت و ڕەحمی پێ دەکات .

الله تعالی دەفەرمووێ : ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (الأعرَاف : ٢٠٤)

واتە : وە هەرکات ئەم قورئانە دەخوێندرێ زۆر بەوردیی ئێوە ئەی ئیمانداران گوێی بۆ ڕاگرن و بێدەنگ بن، سا بەڵکو الله تعالی لەبەر ڕێز لێنان و قایلبوون بەگەورەیی و ڕێزداریی قورئان، بەزەیی پێتانا بێتەوە .

وه بیستوویەتی الله تعالى دەفەرمووێ : ﴿**فَبَشِّرْ عِبَادِ** (١٧) **ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ**﴾ **(الزُّمَر)**

واتە : سا تۆش موژدە بە بەندەکانی من بدە، ئەوانەیان گوێ دەدەنە قسەو گفتوگۆ، جا بەشوێن چاکترینندا دەچن و پەیڕەوی لێ دەکەن .

ئەوانەن کە الله تعالى بەرەو خۆی ڕێنمایی کردوون بۆ ئەوەی خۆی پێی ڕازیە، هەر ئەوانەشن ژیرو خاوەن عەقڵن .

ئا ئەوە سیفەت و خووڕەوشتی کەسە ژیرەکانە .

**والحمد لله حق حمده**

**وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم**

١ - لە أبي أمامەوە رضي اللە عنە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرمووێ : درووست نییە فرۆشتنی کۆیلەی کچی گۆرانیبێژ، وە نە کڕینیان و نە بازرگانی پێکردنیان، وە خواردنی نرخەکانیان حەڕامە، وە دەربارەی هاوشێوەی ئەوانەیە اللە تعالی ئەو ئایەتەی دابەزاندووە ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ **(لقمَان : ٦)** .

واتە : لە نێو خەڵکدا هەیە وتەی بێهودە دەکڕێ، تا خەڵکی لە ڕێگەی اللە تعالی چەواشە و گومڕا بکات .

٢ - مکحول دەڵێت : هەرکەسێك کۆیلەیەکی ئافرەت بکڕێت نایکڕێت تەنها بۆ گۆرانی ووتن نەبێت، جا ئەوە لەو کەسانەیە کە اللە تعالی لەبارەیان دەفەرمووێ : ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ﴾ .

٣ - لە صفوان ی کوڕی ئومەییەوە رضي اللە عنە، فەرمووی : ئێمە لە لای رسول اللە بووین ﷺ جا عمرو ی کوڕی قُرّ هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەی رسول اللە، بێگومان بەدبەختیم لەسەر نوسراوە، نابینرێ ڕزقم دەست بکەوێ تەنها بە لێدانێ دەفەکەم نەبێ بە دەستم، جا مۆڵەتم بدە بۆ گۆرانی ووتن بەبێ قسەی نابەجێ؟

جا رسول اللە ﷺ فەرمووی : مۆڵەتت بۆ نییە بە هیچ شێوەیەك یان ڕێزت بگرم، درۆت کرد ئەی دوژمنی اللە تعالی، بێگومان اللە تعالی ڕزقی حەڵاڵ و پاکی داوی، تۆ ئەو ڕزقەت هەڵبژاردووە کە اللە تعالی لەسەری حەڕام

كردووى لە جياتى ئەوەى الله تعالى بۆى حەڵاڵ كردووى، ئەگەر من پێشتر تۆم ئاگادار بكردبايەوە ئەوا ئاواو ئاوام لێدەكردى، هەستە لەلام و تۆبە بكە بۆلاى الله تعالى، ئەگەر تۆ ئەوكارە بكەيتەوە دواى ئەوەى ئاگادارم كرديتەوە ئەوا لێت دەدەم بەلێدانێكى زۆر بە ئازار، وە سەريشت دەتاشم وەكو نموونەيەك، وە دوورت دەخەمەوە لە خێزانەكەت، وە فەرمان بە گەنجەكانى مەدينە دەكەم كە بێن و شتومەكەكانت ببەن .

جا عمرو هەستا زۆر بە ترساوى، پێيەوە ديار بوو لە خەم و خراپەو ڕسوايى كە كەس نازانێ تەنها الله تعالى نەبێ، جا كاتێ پشتى هەڵكرد و ڕۆيشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى : ئا ئەو تاوانبارانە، يەكێ بمرێ لەوان بەبێ تەوبە و گەڕانەوە بۆلاى الله تعالى ئەوا الله تعالى زيندووى دەكاتەوە لە ڕۆژى قيامەتدا وەكو ئەوەى لە دونيادا بووبێ سەرژنانى و ڕووت و بەبێ ئەوەى پارچە جلێكى هەبێ خۆى پێ دابپۆشێ لە خەڵكى، هەركاتێ هەڵدەستێتەوە دەكەوێتە سەر زەوى .

---

: رواه ابن ماجه (٢٦١٣)

٤ - لە علي كوڕى أبو طالب ەوە رضي الله عنه، دەفەرمووێت : رسول الله ﷺ فەرمووى : نێردراوم بە شكاندنى ئامێرە مۆسيقييەكان .

وە سوێند دەخۆم بە پەروەردگارم عزَّوَجَل : هیچ بەندەیەك نییە عارەقێك بخواتەوە لە دونیا ئیللا الله تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا ئاوێکی بەکوڵ و زۆر گەرمی دەرخوارد دەدات، سزای دەدات یان لێی خۆش دەبێت .

پاشان رسول الله ﷺ فەرمووی : ئیش و کاسبی گۆرانیبێژی پیاو و ئافرەت حەڕامە .

وە کاسبی ئافرەتی زیناکار حەڕامە .

وە مافە لەسەر الله تعالی کەوا گۆشتێك نەخاتە بەهەشتەوە کە بە حەڕام گەشەی کردووە و دروست بووە .

٥ - لە أبي ئومامەوە رضي الله عنه دەفەرمووێت : رسول الله ﷺ فەرمووی : نێردراوم بە ڕەحمەت و ڕێنموونی بۆ جیهانیان، بۆ سڕینەوە و نەهێشتنی بت پەرستی و ئامێری مۆسیقی و گۆرانی و کاروکردەوەی جاهیلی .

٦ - لە أبي ئومامەوە رضي الله عنه ، دەفەرمووێت : رسول الله ﷺ فەرمووی : بێگومان الله تعالی منی ناردووە بە ڕەحمەت و ڕێنموونی بۆ جیهانیان، وە فەرمانی پێکردووم کەوا ئامێری مۆسیقا و عارەق و سەرخۆشکەر بسڕمەوە و نەهێڵم، وە ئەو بتانەی کە دەپەرستران لە جاهیلی .

٧ - عبداللەی کوڕی عمری کوڕی عاص رضي الله عنهما، دەفەرمووێت : بەڕاستی ئەو ئایەتەی کە لە قورئاندا هاتووە : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ

**وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (المَائدة : ٩٠)**

له تەوڕاتدا بەو شێوەیە : بێگومان الله تعالى حەق و ڕاستی دابەزاندووە بۆ ئەوەی باتڵی پێ لەناوببات وە بەتاڵی بکاتەوە بەهۆیەوە یاری و ئامێرە مۆسیقییەکان و الزاهر و شايي و سەما و الزمارات - جۆرە ئامێرێکی مۆسیقایە - و الطنبور و شیعر و عارەق ئەگەر بۆ جارێکیش بێت ئەو کەی تامی کردبێت، وە پەروەردگارم تبارك وتعالى سوێندی خواردووە بە سوێندی خۆی وە توندی و بەهێزی حیله هەر کەسێك عارەق بخواتەوە دوای ئەوەی کە حەڕامم کردووە لەسەری ئیللا تووشی تینوویەتی دەکەم لە ڕۆژی قیامەت، وە هەر بەندەیەکم وازی لێبهێنێت دوای ئەوەی حەڕامم کرد لەسەری ئیللا خواردنەوەی پێدەدەم لە حظيرة القدس - مەبەست پێی بەهەشتە والله اعلم - .

٨ - ئیمامی علي کوڕی أبو طالب دەفەرمووێت : رسول الله ﷺ ڕێگری کردووە لە لێدانی دەف و تەپڵ و دەنگی شمشاڵ .

٩ - لە عبدالرحمن ى کوڕی عەوف رضي الله عنهما، دەفەرمووێت : رسول الله ﷺ دەستی گرتم و بردمی بۆلای دار خورمایەك، لەوێدا ئیبراهیمی کوڕی لەسەرە مەرگدا بوو، عبدالرحمان دەفەرمووێ : پێغەمبەر ﷺ ئیبراهیمی وەرگرت و لەباوەشی خۆی داینا، چاوەکانی فرمێسکی لێدەهاتنە

خوار، پاشان فهرمووی : ئهی ڕۆڵهکهم، هیچ شتێکم لهدهست نایهت بۆت بکهم لای الله تعالی، پاشان گریا .

جا ووتم: ئهی رسول الله، ئهوه دهگرییت! ئایا ڕێگریت نهکردووه له گریان لهسهر مردوو؟

پێغهمبهر ﷺ فهرمووی : (بێگومان ڕێگریم کردووه له النوح - هاوار و قیژه لهسهر مردوو - له دوو دهنگی گهمژهی تاوانبار : دهنگێك له کاتی نیعمهت و خۆشی، یاری و گاڵته و گهپی گۆرانی و مۆسیقای شهیتان .

وه دهنگێك له کاتی بهڵا و ناخۆشی، ڕوومهت ڕنین و یهخه دڕاندن و هاوار و قیژهی شهیتان .

وه ئهوه - گریانێکی هێواش و لهسهرخۆ والله اعلم - ، ڕهحمهت و میهرهبانییه، وه هەرکەسێك ڕهحم نهکات بهکهسی بهرامبهر ئهوا الله تعالی ش ڕهحمی پێناکات .

ئهی ئیبراهیم، ئهگهر فرمانێکی حهق نهبوایه، وه بهڵێنێکی ڕاست نهبوایه، وه ئهوه ڕێگهیهکه پێویسته پێیدا بڕۆین ههتا کۆتا کهسمان دهگاتهوه به سهرهتامان، غهمبار دهبووین بۆت به غهمباریهك زیاتر و توندتر لهوه، وه بێگومان ئێمه بۆتۆ زۆر غهمبارین، چاو دهگریێت، وه دڵ غهمبار دهبێت، وه شتێك ناڵێین که الله تعالی تووڕه بکات) .

: (رواه الترمذي : ١٠٠٥)

## پاكڕاگرتنى گوێيەكانى كەسە عاقڵەكان لە گوێگرتن لەو ئامێرە مۆسيقييانەى كە باسمانكرد

**١٠** - لە نافعەوە، دەفەرمووێت : كەوا ڕۆژێكيان لەگەڵ عبد اللهى كوڕى عمر رضي الله عنهما بووم بە ڕێگەدا دەڕۆيشتين، جا گوێى لەدەنگى شمشاڵى شوانێك بوو، جا ڕێگاكەى گۆڕى و پاشان بە نافعى ووت : ئايا دەنگى دەبيستى؟

نافع ووتى بەڵێ .

نافع دەڵێت : بەردەوام دەيووت ئەى نافع، دەنگى دەبيستى؟ ووتم : نەخێر، جا عبد اللهى كوڕى عمر هەردوو پەنجەكانى دەرهێنا لە گوێكانى، پاشان گەڕايەوە سەر ڕێگاكە،

عبداللهى كوڕى عمر رضي الله عنهما دەفەرمووێت : بينيم رسول الله ﷺ بەم شێوەيەى دەكرد .

: رواه احمد (٤٥٣٥ ، ٤٩٦٥)، و ابو داود (٤٩٢٤) .

١١ - نافع بۆی گێڕاینەوە دەفەرمووێ : لە دوای عبد الله ی کوڕی عمر رضي الله عنهما بووم بە سواری حوشتر، کاتێ تێپەڕی بەلای شوانێکدا شمشاڵی لێدەدا، جا لە ڕوخساری حوشترەکەی داو ڕووی وەرگێڕا و دوو پەنجەی خستە ناو هەردوو گوێیەکانیەوە و دەیووت : ئایا دەنگی دەبیستی نافع؟ ئایا دەنگی دەبیستی؟ هەتاوەکو دەنگەکە پچڕا و نەما .

ووتم : نابیستم، جا عبد اللهی کوڕی عمر حوشترەکەی هێناوە سەر ڕێگاکە و ووتی : بینیم رسول الله ﷺ بەم شێوەیەی کرد کاتێ شتێکی لەم شێوەی بیست .

---

: رواه ابو داود (٤٩٢٥) .

١٢ - بۆی گێڕاینەوە محمدی کوڕی خالد، جا بەهەمان شێوە باسی فەرموودەکەی کرد .

١٣ - بۆی گێڕاینەوە مالکی کوڕی أنس، لە محمدی کوڕی المنکدر، دەڵێت : لە ڕۆژی قیامەتدا دەوترێ : لە کوێن ئەوانەی خۆیان و گوێیەکانیان پاکڕادەگرن لە گۆرانی و مۆسیقای شەیتان؟

بیانخەنە ناو باخی میسکەوە، پاشان دەووترێ بە فریشتەکان : وایان لێبکە گوێیان لە سوپاس و ستایشەکانم بێت و ببیستن - واتە ئەوانەی کە گوێیان دەپارێزن لە بیستنی حەڕام ئەوا وەك پاداشتێك بۆیان الله تعالى سوپاس و ستایشیان دەکات و ڕەزامەندی خۆی بۆیان دەردەبڕێ - ، وە هەواڵیان پێ بدە کەوا هیچ ترسێکیان لەسەر نییە و هیچ دڵتەنگ و غەمباریش نەبن .

**١٤** - لە مالکی کوڕی أنس ەوە، لە محمدی کوڕی المنکدر، دەڵێت : الله تعالى بە فریشتەکان دەفەرمووێ لە ڕۆژی قیامەتدا : لە کوێن ئەوانەی خۆیان و گوێیەکانیان پاکڕادەگرن لە گۆرانی و مۆسیقای شەیتان؟ بیانخەنە ناو باخی میسکەوە، پاشان بە فریشتەکان دەفەرمووێ : وایان لێبکە گوێیان لە سوپاس و ستایشەکانم بێت و ببیستن، وە هەواڵیان پێ بدە کەوا هیچ ترسێکیان لەسەر نییە و هیچ دڵتەنگ و غەمباریش نەبن .

**١٥** - لە منصورەوە، ئیمامی مجاهد دەڵێت : بانگکەرێك بانگ دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا : لە کوێن ئەوانەی خۆیان و گوێیەکانیان پاکڕادەگرن لە گۆرانی و مۆسیقای شەیتان؟

مجاهد دەڵێت : جا الله تعالى دەیانخاتە ناو باخێک لە میسك، پاشان بە فریشتەکان دەفەرمووێ : وایان لێبکە گوێیان لە سوپاس و ستایشەکانم بێت و ببیستن، وە هەواڵیان پێ بدە کەوا هیچ ترسێکیان لەسەر نییە و هیچ دڵتەنگ و غەمباریش نەبن .

## محمدی کوڕی حسێن دەڵێت :

**١٦** - لە ناو خەڵکی کۆمەڵێك هەن نەفسی خۆیان پاك ڕادەگرن لە گوێگرتن لە گۆرانی و مۆسیقا کە کەمێك چێژ و خۆشی تێدایە، بۆیە کەسی عاقڵ لە ناو خەڵکی ناهێڵێت نەفسی شوێن هەوا و ئارەزووی بکەوێت بەڵکو ڕێگری لێدەکات لەو کارە .

بیستوویەتی الله تعالی دەفەرمووێ : ﴿**وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ** (٤٠) **فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَىٰ**﴾ **(النـازِعات)**

واتە : بەڵام ئەوکەسەی لە گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگاری خۆی ترسابێت و جڵەوی نەفسی لە هەواو ئارەزوو گرتبێتەوە، جا ئەوە بێگومان بەهەشتە جێی مانەوەو حەوانەوەی .

لەم ووتەی الله تعالی تێگەیشتووە بۆیە نەفسی خۆی پاراستووە لە حەزوو ئارەزووەکانی بە هیدایەت و یارمەتیدانی الله تعالی بۆی، ئا ئەوە عاقیبەت و کۆتایی ئەو کەسەیە کە لەسەرەوە باسمانکرد .

زانیویەتی کە گوێگرتن لەوەی کە نەفس حەزی لێیەتی لە گۆرانی و مۆسیقا و شتی بێ مانا و بێ سوود ڕێگەپێنەدراوە بۆیە پشتی لێ هەڵکرد و ڕووی لێوەرگێڕا .

بیستوویەتی الله تعالی لە مەدح و ستایشی عاقڵەكان دەفەرمووێ :
﴿وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغۡوَ أَعۡرَضُواْ عَنۡهُ﴾ (القَصَص : ٥٥)

واتە : هەركە قسەی بێسوود دەبیستن، ڕووی لێوەر دەگێڕن .

وە بیستوویەتی الله تعالی دەفەرمووێ :

﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ﴾ (المُؤمنون : ٣)

واتە : ئەوانەش كە لە بەرامبەر كار و كردار و ووتەی پڕوو پووچ و شتی بێ ماناو بێ سوود، ڕوو هەڵدەسووڕێنن و پشت هەڵدەكەن .

جا الله تعالی مەدح و ستایشی كردن بە پشت هەڵكردنیان لە قسە و كرداری باتڵ، جا الله تعالی دەیەوێت بەندەكەی گوێ لەو شتانە بگرێت كە لەو نزیكی دەكاتەوە بەهۆی گوێگرتنی لە شتی باش و چاك گەورەكەی [واتە الله تعالی] خۆشی دەوێت و ڕەحمی پێ دەكات .

الله تعالی دەفەرمووێ : ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ (الأعرَاف : ٢٠٤)

واتە : وە هەركات ئەم قورئانە دەخوێندرێ زۆر بەوردیی ئێوە ئەی ئیمانداران گوێی بۆ ڕاگرن و بێدەنگ بن، سا بەڵكو الله تعالی لەبەر ڕێز لێنان و قایلبوون بەگەورەیی و ڕێزداریی قورئان، بەزەیی پێتانا بێتەوە .

وه بیستوویەتی الله تعالی دەفەرمووێ : ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ (١٧) ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ (الزُّمَر)

واتە : سا تۆش موژدە بە بەندەکانی من بدە، ئەوانەیان گوێ دەدەنە قسەو گفتوگۆ، جا بەشوێن چاکتریندا دەچن و پەیڕەوی لێ دەکەن .

ئەوانەن کە الله تعالی بەرەو خۆی ڕێنمایی کردوون بۆ ئەوەی خۆی پێی ڕازیە، هەر ئەوانەشن ژیرو خاوەن عەقڵن .

ئا ئەوە سیفەت و خووڕەوشتی کەسە ژیرەکانە .

والحمد لله حق حمده

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

https://t.me/KitabSalaff